# شەرحی

## عەقیدەی ئیمامی شافعی رَحِمَهُ ٱللَّهُ

ئامادەکردنی

عوسمان ئەحمەد حاتەم

چاپی یەکەم



# شەرحی

## عەقیدەی ئیمامی شافعی رحمه الله

ئامادەکردنی

عوسمان ئەحمەد حاتەم

چاپی یەکەم

## پێشەکی

إِنَّ الْحَمْدَ لِلَّهِ، نَحْمَدهُ وَنَسْتَعِينهُ وَنَسْتَغْفِره، وَنَعُوذُ بِاَللَّه مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا وَمِنْ سَيِّئَاتِ أَعْمَالنَا مَنْ يَهْدِهِ اللَّه فَلَا مُضِلّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَا هَادِي لَهُ وَأَشْهَد أَنْ لَا إِلَه إِلَّا اللَّه وَحْده لَا شَرِيك لَهُ، وَأَشْهَد أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْده وَرَسُوله.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾(آل عمران).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١﴾(النساء).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾(الأحزاب).

أَمَّا بَعْد :

فإنّ أصْدَقَ الحَديثِ كتابُ اللّهِ، وخَيرَ الهَدي هَدْيُ محمَّدٍ ﷺ وشرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُها، وكلَّ مُحْدَثَةٍ بدعةٌ، وكلَّ بدعةٍ ضَلالَةٌ، وكلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّارِ؛ وبعد:

ئەم نوسراوە شەرح و ڕاڤەکردنی نوسراوێکی کورتی پێشەوا شافعییە لەسەر هەندێك ناو و سیفەتە پیرۆز و جوانەکانی خوای پەروەردگار، تێدا هاوڕایە لەگەڵ پێشەواکانی سەلەف و ئەو ناو و سیفەتانەی بۆ خوای پەروەردگار سەلماندووە، نەلێکدانەوەی هەڵە و نەتەعتیل و نەتەشبیهی نەکردووە بەڵکو سەلماندوویەتی بەبێ پرسیارکردن لە چۆنییەتی و تێیدا باسی ئەوەی کردووە بوار بۆ عەقڵ و بیرکردنەوە نییە لە پرسی ناو و سیفەتە جوانەکانی خوای پەروەردگاردا.

کۆمەڵێك لە زانایان لە کتێب و نوسراوەکانیاندا ئاماژەیان بۆ ئەم نوسراوەی پێشەوا شافعی کردووە:

ئەبویەعلای حەنبەلی دەڵێت: عن (یونس ابن عبد الأعلی المصری قال: سمعت أبا عبد الله محمد بن إدریس الشافعی یقول: ـ وقد سئل عن صفات الله، وما ینبغی أن یؤمن به ـ؟ فقال: لله تبارك وتعالی أسماء وصفات جاء بها کتابه، وأخبر بها نبیه ﷺ أمته، لا یسمع أحدا من

خلق الله قامت عليه الحجة أن القرآن نزل به، وصح عنه بقول النبى ﷺ.....)[١].

ئیبن قەیم دەڵێت: عن (يُونُسُ بْنُ عَبْدِ الْأَعْلَى قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا عَبْدِ اللَّهِ مُحَمَّدَ بْنَ إِدْرِيسَ الشَّافِعِيَّ يَقُولُ وَقَدْ سُئِلَ عَنْ صِفَاتِ اللَّهِ وَمَا يُؤْمِنُ بِهِ فَقَالَ: لِلَّهِ تَعَالَى أَسْمَاءٌ وَصِفَاتٌ جَاءَ بِهَا كِتَابُهُ وَأَخْبَرَ بِهَا نَبِيُّهُ أُمَّتَهُ لَا يَسَعُ أَحَدًا مِنْ خَلْقِ اللَّهِ قَامَتْ عَلَيْهِ الْحُجَّةُ رَدُّهَا...)[٢].

ئیبن حەجەری عەسقلانی بە کورتی ئاماژەی بۆ کردووە دەڵێت: (وَأخرج بن أَبِي حَاتِمٍ فِي مَنَاقِبِ الشَّافِعِيِّ عَنْ يُونُسَ بْنِ عَبْدِ الْأَعْلَى سَمِعْتُ الشَّافِعِيَّ يَقُولُ لِلَّهِ أَسْمَاءٌ وَصِفَاتٌ لَا يَسَعُ أَحَدًا رَدُّهَا وَمَنْ خَالَفَ بَعْدَ ثُبُوتِ الْحُجَّةِ عَلَيْهِ فَقَدْ كَفَرَ وَأَمَّا قَبْلَ قِيَامِ الْحُجَّةِ فَإِنَّهُ يُعْذَرُ بِالْجَهْلِ لِأَنَّ عِلْمَ ذَلِكَ لَا يُدْرَكُ بِالْعَقْلِ وَلَا الرُّؤْيَةِ وَالْفِكْرِ...)[٣].

عوسمان ئەحمەد حاتەم
گەرمیان ـ کەلار
١٥ ربيع الآخر ١٤٤٥
٢٠٢٣/١٠/٣٠

---

(١). (طبقات الحابلة)(١/٢٨٣).

(٢). (اجتماع الجيوش الاسلامية)(٢/١٦٥).

(٣). (فتح الباري)(١٣/٤٠٧).

ئەم دەقەی من لەم نامیلکەیەدا هێناومە و شەرحم کردووە بریتییە لەو دەقەی لە دەست نوسی (الثلاثون من المشيخة البغدادية)دا (أبوطاهر السلفي)(٥٧٦هـ) هێناویەتی، لە چەند وشەیەکدا جیاوازە، و ئەمە دەقی نوسراوەکەیە:

(قَالَ يونس بن عبد الأعلى المصري: سَمِعْتُ أَبَا عَبْدِ اللَّهِ مُحَمَّدَ بْنَ إِدْرِيسَ الشَّافِعِيَّ، يَقُولُ -وَقَدْ سُئِلَ عَنْ صِفَاتِ اللَّهِ وَمَا يَنْبَغِي أَنْ يُؤْمِنَ بِهِ- فَقَالَ:

لِلَّهِ تبارك وتعالى أَسْمَاءٌ وَصِفَاتٌ جَاءَ بِهَا أَنْبِيَاؤهُ وَخَبَّرَ بِهَا نَبِيُّهُ ﷺ أُمَّتَهُ، لا يَسَعُ أَحَدٌ مِنْ خَلْقِ اللَّهِ كَانَتْ لَدَيْهِ الْحُجَّةُ، أَنَّ الْقُرْآنَ نَزَلَ بِهِ، وَصَحَّ عِنْدَهُ، بِقَوْلِ النَّبِيِّ فِيمَا رُوِيَ عَنْهُ لا يَجُوزُ خِلافُهُ.

فَإِنْ خَالَفَهُ بَعْدَ ثُبُوتِ الْحُجَّةِ عَلَيْهِ بِهِ، فَهُوَ بِاللَّهِ كَافِرٌ.

فَأَمَّا قَبْلَ ثُبُوتِ الْحُجَّةِ مِنْ جِهَةِ الْخَبَرِ فَمَعْذُورٌ بِالْجَهْلِ، لأَنَّ عِلْمَ ذَلِكَ لا يُدْرَكُ بِالْعَقْلِ، وَلا بِالرُّؤْيَةِ وَالْفِكْرِ.

وَنَحْوُ ذَلِكَ إِخْبَارُ اللَّهِ إِيَّانَا أَنَّهُ:

سَمِيعٌ، وَأَنَّ لَهُ يَدَيْنِ، بِقَوْلِهِ: ﴿بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ ﴿٦٤﴾﴾(المائدة).

وَأَنَّ لَهُ يَمِينًا، بِقَوْلِهِ: ﴿وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ ﴿٦٧﴾﴾(الزمر).

وَأَنَّ لَهُ وَجْهًا، بِقَوْلِهِ: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ﴾ (٨٨)(القصص)، وَقَوْلُهُ: ﴿وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ﴾ (٢٧)(الرحمن).

وَأَنَّ لَهُ قَدَمًا، بِقَوْلِهِ: ﷺ: ((حَتَّى يَضَعَ الرَّبُّ فِيهَا قَدَمَهُ)) يَعْنِي: فِي جَهَنَّمَ.

وَأَنَّهُ يَضْحَكُ مِنْ عَبْدِهِ الْمُؤْمِنِ، بِقَوْلِهِ: ﷺ -لِلَّذِي قُتِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ-: ((أَنَّهُ يَلْقَى اللَّهَ وَهُوَ يَضْحَكُ إِلَيْهِ)).

وَأَنَّهُ يَهْبِطُ كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى سَمَاءِ الدُّنْيَا، يُخْبِرُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِذَلِكَ.

وَأَنَّهُ لَيْسَ بِأَعْوَرَ، لِقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ إِذْ ذَكَرَ الدَّجَّالَ، فَقَالَ: ((إِنَّهُ أَعْوَرُ، وَإِنَّ رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأَعْوَرَ)).

وَ((أَنَّ الْمُؤْمِنِينَ يَرَوْنَ رَبَّهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأَبْصَارِهِمْ كَمَا يَرَوْنَ الْقَمَرَ لَيْلَةَ الْبَدْرِ)).

وَأَنَّ لَهُ إِصْبَعًا، بِقَوْلِهِ ﷺ: ((مَا مِنْ قَلْبٍ إِلا وَهُوَ بَيْنَ أُصْبُعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ الرَّحْمَنِ عزوجل)).

وَإِنَّ هَذِهِ الْمَعَانِيَ الَّتِي وَصَفَ اللَّهُ بِهَا نَفْسَهُ، وَوَصَفَ بِهَا رَسُولُهُ ﷺ، لا يُدْرِكُ حَقِيقَةَ ذَلِكَ بِالْفِكْرِ، وَالرُّؤْيَةِ، وَلا يَكْفُرُ بِالْجَهْلِ بِهَا أَحَدٌ، إِلا بَعْدَ انْتِهَاءِ الْخَبَرِ إِلَيْهِ بِهَا.

وَإِنْ خَلَّفَ الْوَارِدُ لِذَلِكَ خَبَرًا يَقُومُ فِي الْفَهْمِ مَقَامَ الْمُشَاهَدَةِ فِي السَّمَاعِ، وَجَبَتِ الدَّيْنُونَةُ عَلَى سَامِعِهِ بِحَقِيقَتِهِ، وَالشَّهَادَةِ عَلَيْهِ، كَمَا عَايَنَ وَسَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَلِمَنْ ثَبَّتَ هَذِهِ الصِّفَاتِ، وَتَنْفِي التَّشْبِيهَ، كَمَا نَفَى ذَلِكَ عَنْ نَفْسِهِ تَعَالَى ذِكْرُهُ، فَقَالَ: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ ﴿١١﴾﴾((الشورى)).

# عەقیدەی ئیمامی شافعی

## (قَالَ يونس بن عبد الأعلى المصري)

واتە: یونسی کوڕی عبدالأعلى میسری گوتی:

یونسی کوڕی عبدالأعلى میسری؛ کوڕی مەیسەرەی کوڕی حەفصی کوڕی حەیانە، پێشەوا و شێخی ئیسلامە، کونییەی ئەبوموسای صەدەفییە میسری موقریء و حافزە، دایکی ناوی فولەیحەی کچی ئەبانی توجەیبییە، لە ساڵی سەد و حەفتای کۆچی لە مانگی زوالحجە لە دایك بووە، مامۆستای ئیبن ئەبوحاتەمی ڕازییە، فێرخواز و هاوەڵی پێشەوا شافعییە، مسلم و نەسائی و ئیبن ماجە و ئیبن خوزەیمە و جگە لەوانیش فەرموودەیان لێوە ڕیوایەتکردووە، بەیانی ڕۆژی دوو شەممە دووی ڕەبیعی کۆتایی لە ساڵی دوو سەد و شەست و چوار وەفاتی کردووە[١].

  

---

(١). بڕوانە (سير أعلام النبلاء)(١٠/٥٣١-٥٣٢).

**(سَمِعْتُ أَبَا عَبْدِ اللَّهِ مُحَمَّدَ بْنَ إِدْرِيسَ الشَّافِعِيَّ، يَقُولُ)**

واتە: گوێم لێبوو ئەبوعبدالله محمدی کوڕی ئیدریسی شافعی دەیگوت:

پێشەوا شافعی محمدی کوڕی ئیدریسی کوڕی عەباسی کوڕی عوسمانی کوڕی شافعی کوڕی سائبی کوڕی عوبەید کوڕی عەبدی یەزیدی کوڕی هیشامی کوڕی موتەلبی کوڕی عەبدی مەنافی کوڕی قوسەی کوڕی کیلابی کوڕی مورەی کوڕی کەعبی کوڕە لوئەی کوڕی غالبی قورەیشییە، پێشەوا و شەرعزان و فەرموودەناسی و زمانزانی ئوممەتە، لە ئالوبەیتی پێغەمبەری خوایە ﷺ، لە شاری غەزە لە فەلەستین لە دایکبووە و لە تەمەنی منداڵیدا باوکی وەفاتی کردووە، دایکی بردوویەتی بۆ شاری مەککەی پیرۆز، ئیبن ئەبوحاتەم دەڵێت: گوێم لێ بوو عەمری سەواد دەیگوت: شافعی گوتی: لە عەسقەلان لەدایکبووم، کاتێك تەمەنم دوو ساڵ بوو دایکم بردمی بۆ مەککە، ئیبن عبدالحكم دەڵێت: شافعی پێی گوتم: ساڵی سەد و پەنجا لە غەزە لە دایکبووم، موزەنی دەڵێت: گوێم لێ بوو شافعی دەیگوت: تەمەنم حەوت ساڵ بوو قورئانم لەبەرکرد، و (الموطأ)م لەبەر کرد تەمەنم دە

ساڵ بوو، پێشەوا ئەحمەد دەربارەی شافعی مامۆستای دەڵێت: (كَانَ الشَّافِعِيُّ كَالشَّمْسِ لِلدُّنْيَا، وَكَالْعَافِيَةِ لِلنَّاسِ)[(١)].

واتە: شافعی وەك خۆر بوو بۆ دونیا، وەك عافییەت بوو بۆ خەڵك.

ڕەبیعی كوڕی سولەیمان دەڵێت: شافعی شەوی جومعە، دوای ئەوەی نوێژی مەغریبی كرد لە كۆتا ڕۆژی مانگی ڕەجەب لە دوای عیشا وەفاتی كرد، لە ڕۆژی جومعە ناشتمان، كاتێك لە ناشتنی بووینەوە و گەڕاینەوە مانگی شەعبانی ساڵی دوو سەد و چوارمان بینی[(٢)]؛ لە وڵاتی وڵاتی میسر لە تەمەنی پەنجا و چوار ساڵیدا وەفاتی كردووە دوای ئەوەی زانستی بە هەموو دونیادا بڵاوبوویەوە بە ڕەحمەت بێت.

  

---

(١). (تاريخ الإسلام)(١٤/١٦٤).

(٢). بڕوانە (سير أعلام النبلاء)(١٠/٥)، (آداب الشافعي ومناقبه)(٥٦).

**(وَقَدْ سُئِلَ عَنْ صِفَاتِ اللَّهِ وَمَا يَنْبَغِي أَنْ يُؤْمِنَ بِهِ، فَقَالَ:)**

واتە: پرسیاری لێکرا دەربارەی سیفەتەکانی خوای پەروەردگار، و ئەوەی پێویستە باوەڕدار باوەڕی پێی هەبێت، گوتی.

پرسیارکردن دەبارەی ناو و سیفەتەکانی خوای پەروەردگار ڕێگا پێدراوە، ئەوەی سەلەف یاساغییان کردووە و نەهییان کردووە پرسیاری دەربارە بکرێت چۆنییەتی ناو و سیفەکانی خوای بالادەستە، نەوەك ماناکانی، بەیهەقی لە عبداللەی کوڕی وەهبەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: (كُنَّا عِنْدَ مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ فَدَخَلَ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا أَبَا عَبْدَ اللَّهِ، ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ۝٥﴾(طه)، كَيْفَ اسْتِوَاؤُهُ؟ قَالَ: فَأَطْرَقَ مَالِكٌ وَأَخَذَتْهُ الرُّحَضَاءُ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَقَالَ: ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ۝٥﴾(طه)، كَمَا وَصَفَ نَفْسَهُ، وَلَا يُقَالُ: كَيْفَ، وَكَيْفٌ عَنْهُ مَرْفُوعٌ، وَأَنْتَ رَجُلُ سُوءٍ صَاحِبُ بِدْعَةٍ، أَخْرِجُوهُ، قَالَ: فَأُخْرِجَ الرَّجُلُ)[١].

واتە: لای ئیمامی مالکی کوڕی ئەنەس دانیشتبووین، پیاوێك هاتە ژوورەوە، گوتی: ئەی باوکی عبداللە: خوای میهرەبان بەرز و بڵندە

---

(١). (الأسماء والصفات)(٢/٣٠٤).

بەسەر عەرشدا، بەرز و بڵندبوونەکەی چۆنە؟ مالك بێدەنگبوو و نێوچاوانی عارەقی کرد، پاشان سەری بەرزکردەوە، گوتی: خوای میهرەبان بەرز و بڵندە بەسەر عەرشدا، بەوشێوەیەی وەسفی نەفسی خۆی کردووە، ناگوترێت: چۆن، پرسیار دەربارەی چونییەتی هەڵگیراوە و نازانرێت، تۆ کەسێکی خراپیت و خاوەن بیدعەیت، دەریکەن، وەهب دەڵێت: پیاوەکەیان دەرکرد.

  

پێشەوا شافعی دەڵێت: **(لِلَّهِ تَعَالَى أَسْمَاءٌ وَصِفَاتٌ جَاءَ بِهَا كِتَابُهُ وَخَبَّرَ بِهَا نَبِيُّهُ ﷺ أُمَّتَهُ).**

واتە: خوا ﷻ کۆمەڵێك ناو و سیفەتی هەیە لە کتێبەکەیدا هاتووە، و پێغەمبەرەکەی ﷺ بۆ ئوممەتەکەی باسکردووە.

باوەڕبوون بە ناو و سیفەتە جوان و پیرۆزەکانی خوای پەروەردگار یەکێکە لە بەشەکانی باوەڕ و تەوحید، زانراوە زانایان تەوحید و بیروباوەڕیان دابەشکردووە بۆ سێ بەش:

یەکەم: تەوحیدی ئولوهییەت، واتە: بە تەنهای و دڵسۆزی پەرستنی خوا، تەوحیدی عیبادەت و پەرستنیشی پێدەگوترێت.

دووەم: تەوحیدی ڕبوبییەت، واتە: بە تەنها دانانی خوای پەروەردگار لە دروستکردن و ڕۆزیدان و ژیان و مردن و قازانج و زیان و هەموو ماناکانی تری پەروەردگاریێتی.

سێیەم: تەوحیدی ناو و سیفەتە جوان و کامڵ و تەواوەکانی خوای پەروەردگار، پێویستە موسڵمان باوەڕی وابێت خوای گەورە کۆمەڵێك ناو و سیفەتی کامڵ و تەواوی هەیە لە ناو و سیفەتی دروستکراوەکانی ناچێت.

لە قورئان و سوننەتی صەحیحدا بەڵگەی زۆر هاتووە لەسەر سەلماندنی ناو و سیفەتە جوانەکانی پەروەردگار.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٨٠﴾﴾(الأعراف).

واتە: خوا ناوی پیرۆز و جوانی هەیە بەو ناوانە لێی بپاڕێنەوە، وازبهێنن لەو کەسانەی بێباوەڕن بە ناوە پیرۆزە جوانەکانی خوا، لە ئایندەدا پاداشتی ئەو کردارانەیان دەدرێتەوە.

بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((إنَّ لِلَّه تِسْعَةً وتِسْعِينَ اسْمًا مِئَةً إلّا واحِدًا، مَن أحْصاها دَخَلَ الجَنَّةَ)).

واتە: بێگومان خوا نەوەد و نۆ ناوی هەیە سەد یەکێکی کەمە، هەرکەسێك بیانژمێرێت دەچێتە بەهەشتەوە.

واتە: لەبەریان بکات و بەو ناوانە لە خوا بپاڕێتەوە بۆ نموونە بڵێت: یاڕەحمان ڕەحمم پێ بکە، یان تەوەسلیان پێوە بکات بڵێت: پەروەردگارا لەبەر خاتری ناوە جوان و پیرۆزەکانت دڵم لەسەر ئاینەکەت جێگیر بکە، یان بە دەوڵەمەندی خۆت لە هەژاری و ئاتاجی بە دوورم بگرە، سەعدی دەڵێت: ئەم ئایەتە ڕوونکەرەوەی گەورەی زاتی خوا و فراوانی و زۆری وەسفەکانییەتی، خوا ناوی جوانی هەیە، ڕێساکەشی ئەوەیە: هەموو ناوێك بەڵگەبێت لەسەر سیفەتی کەمالی

تەواو و مەزنی ئەوە ناوی جوانە بۆ خوا، چونکە ئەگەر بەڵگە نەبێت لەسەر سیفەتێك بەڵکو تەنها ناوێك بێت ناوی جوان نییە، هەروەها ئەگەر بەڵگە بێ لەسەر سیفەتێك بەڵام سیفەتی کەماڵی تەواو نەبێت، بەوەی سیفەتێك بێت کەموکورتی تێدابێت یان سیفەتێك بێت دابەش بێت لە نێوان ئەوەی سیفەتێکی باش و خراپ لەخۆ بگرێت ئەوە ناوی جوان نییە؛ ئیبن کەسیر دەڵێت: ناوەکانی خوا تەنها ئەو نەوەد و نۆ ناوە نییە، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەی ئەحمەد لە ئیبن مەسعودەوە ﵁ ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((مَا قَالَ عَبْدٌ قَطُّ إِذَا أَصَابَهُ هُمٌّ وَحُزْنٌ: اللَّهُمَّ إِنِّي عَبْدُكَ وَابْنُ عَبْدِكَ، نَاصِيَتِي بِيَدِكَ، مَاضٍ فِيَّ حُكْمُكَ، عَدَلٌ فِيَّ قَضَاؤُكَ، أَسْأَلُكَ بِكُلِّ اسْمٍ سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ، أَوْ أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ، أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ، أَوِ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ، أَنْ تَجْعَلَ الْقُرْآنَ رَبِيعَ قَلْبِي، وَنُورَ بَصَرِي، وَجِلَاءَ حُزْنِي، وَذَهَابَ هَمِّي، إِلَّا أَذْهَبَ اللَّهُ هَمَّهُ، وَأَبْدَلَهُ مَكَانَ حُزْنِهِ فَرَحًا، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، يَنْبَغِي لَنَا أَنْ نَتَعَلَّمَ هَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ؟ قَالَ: أَجَلْ، يَنْبَغِي لِمَنْ سَمِعَهُنَّ أَنْ يَتَعَلَّمَهُنَّ)).

واتە: هیچ کەسێك نییە تووشی خەم و پەژارەیەك ببێت، بڵێت: پەروەردگارا من بەندەی تۆم، کوڕی بەندەی تۆم، کوڕی ئافرەتێکی بەندەی تۆم، فەرمانی من بەدەستی تۆیە، ئەو حوکمەی تۆ دەربارەی من داوتە جێبەجێ دەبێت، ئەو فەرمانەی کردووتە دادگەرانەیە، لێت

دەپاڕێمەوە بە هەموو ناوێك كە ناوی تۆیە و نەفسی خۆتت پێ ناو لێناوە، یان فێری یەكێك لە دروستكراوەكانت كردووە، یان لە كتێبەكەتدا داتبەزاندووە، یان لە زانستی پەنهان لای خۆت هێشتووتەتەوە، قورئان بكەیتە بەهاری دڵم و نوری چاوم و ڕەوێنەرەوەی خەمم و ڕاماڵەری پەژارەم، ئیللا خوا خەم و پەژارەكەی دەڕەوێنێتەوە و بۆی دەگۆڕێت بە دڵخۆشی، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا پێویستە لەسەرمان ئەم نزا و پاڕانەوانە لەبەر بكەین، فەرمووی: بەڵێ، پێویستە هەركەسێك بیستی فێریان بێت و لەبەریان بكات.

تەبەری و ئیبن ئەبوحاتەم لە ئیبن عەباسەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتیان كردووە دەڵێت: ﴿وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَـٰٓئِهِۦۚ﴾ بێباوەڕییان (الإلحاد) ئەوە بوو لات و عوزایان لە ناوەكانی خوا ئەژمار دەكرد.

تەبەری لە ئیبن جورەیجەوە ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: ﴿وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَـٰٓئِهِۦۚ﴾ ناوی عوزایان لە ناوی پیرۆزی العزیزەوە داتاشی بوو، ناوی لاتیان لە ناوی پیرۆزی (الله) داتاشی بوو.

قەنوجی دەڵێت: (الإلحاد) لە ناوەكانی خوا سێ شێوەیە: یان گۆڕینی ناوەكەیە وەك هاوبەش بڕیاردەران ناوی لاتیان لە ناوی (الله)وە وەرگرتبوو، و ناوی عوزایان لە ناوی العزیزەوە وەرگرتبوو، و مەناتیان لە ناوی (المنان) وەرگرتبوو، ئەمە بۆچوونی ئیبن عەباس و موجاهیدە،

یان بە زیادکردنی ناوە وەك ئەوەی ناو دابهێنن لە خۆیانەوە کە خوا ڕێگای پێنەداوە، یان بە نکۆڵیکردنی هەندێك لە ناوەکانی بەوەی هەندێك لە ناوەکانی بسەلمێنن و هەندێکی تریان نکۆڵی لێ بکەن.

دەفەرموێت: ﴿قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَـٰنَ ۖ أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَٱبْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾﴾(الإسراء).

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا پێیان بڵێ: لە خوا (الله) بپاڕێنەوە یان لە ڕەحمان (الرحمن) بە هەرناوێك لە ناوەکانی بپاڕێنەوە، خوا ناوی جوان و پیرۆزی هەیە، زۆر دەنگ بەرز مەکەرەوە لە نوێژەکەتدا و زۆریش دەنگت نزم مەکەرەوە، ڕێگایەکی مامناوەند لە نێوانیان هەڵبژێرە.

بوخاری و مسلم لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە رضي الله عنها ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا﴾، قالَتْ: أُنْزِلَ هذا في الدُّعاءِ)).

واتە: ئەم ئایەتە دەربارەی نزا و پاڕانەوە دابەزیوە.

دەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴿٨﴾﴾(طه).

واتە: خوایە کە هیچ پەرستراوێکی حەق نییە جگە لە ئەو، کۆمەڵە ناوێکی جوان و پیرۆزی هەیە.

دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ۖ هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٢﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْمَلِكُ ٱلْقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلْمُؤْمِنُ ٱلْمُهَيْمِنُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْجَبَّارُ ٱلْمُتَكَبِّرُ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٢٣﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَٰلِقُ ٱلْبَارِئُ ٱلْمُصَوِّرُ ۖ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٤﴾﴾(الحشر).

واتە: خوایە کە هیچ پەرستراوێکی حەق نییە جگە لە ئەو، زانای پەنهان و ئاشکرایە، میهرەبانی بە بەزەییە؛ خوایە هیچ پەرستراوێکی حەق نییە جگە لە ئەو، پاشای حەقە کەس ناتوانێت بەرهەڵستی بکات، پیرۆزە و موبارەکە، لە هەموو کەموکورتییە بە دوورە لە زات و سیفات و کرداری، بەندەکانی ئەمینکردووە لەوەی ستەمیان لێ بکات، یان پێغەمبەرانی بە ڕاست دەخاتەوە بە بەڵگەکانی، چاودێرە بەسەر بەندەکانییەوە و هەموو کردەوەکانیان دەبینێت، بەهێز و توانای باڵادەستە، هەموو دروستکراوەکانی ملکەچ و زەلیلین، و مەزن و گەورەیە، پاکی و بەرزی بۆ خوا لەوەی هاوبەش بڕیاردەران هاوبەشی بۆ بڕیار دەدەن؛ خوا دروستکاری بەدیهێنەری وێنەکێشە بە جوانترین شێوە وێنەی دروستکراوەکانی دەکێشێت، کۆمەڵە ناوێکی زۆر جوانی هەیە، هەموو ئەوەی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە تەسبیحاتی خوا دەکەن، توانای باڵادەست و دانای کارلەجێیە.

لەم ئایەتانەدا چەند ناوێکی پیرۆزی خوا هاتووە، ئیبن کەسیر مانای ئەو ناوانەی کردووە و ئەمە پوختەی مانای هەندێك لەو ناوانەیە، ﴿ٱلْقُدُّوسُ﴾ وەهبی کوڕی مونەبە دەڵێت: واتە: پاك، موجاهید و قەتادە دەڵێن: واتە: موبارەك، ئیبن جورەیج دەڵێت: فریشتە بەڕێزەکان پیرۆز ڕایدەگرن، ﴿ٱلسَّلَٰمُ﴾ واتە: سەلامەتە لە هەموو کەموکورتی و عەیبێك لە زات و سیفات و کردارەکانی، ﴿ٱلْمُؤْمِنُ﴾ زەحاك دەڵێت: ئیبن عەباس دەڵێت: دروستکراوەکانی ئەمینکردووە لەوەی ستەمیان لێ بکات، ئیبن زەید دەڵێت: بەندە باوەڕدارەکانی بەڕاست خستووەتەوە لە باوەڕیان بە پەروەردگاریان، ﴿ٱلْمُهَيْمِنُ﴾ ئیبن عەباس و زیاتر لە زانایەکی تر دەڵێن: شاهیدە بەسەر کردەوەی بەندەکانییەوە، واتە: چاودێرییانە، وەك ئەو ئایەتەی دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ۝٩﴾(البروج)، ﴿ثُمَّ ٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ ۝٤٦﴾(يونس)، ﴿ٱلْجَبَّارُ﴾ قەتادە دەڵێت: دروستکراوەکانی ناچارکردووە لەسەر هەرشتێك کە دەیەوێت، تەبەری دەڵێت: واتە: کاروباری دروستکراوەکانی بەڕێوە دەبات بەوشێوەیەی بەرژەوەندییانە، ﴿ٱلْمُتَكَبِّرُ﴾ بەرز و گەورە و مەزنە و دوورە لە هەموو خراپەیەك.

ئەم ئایەت و فەرموودانە بەڵگەن لەسەر سەلماندنی ناوە جوان و پیرۆزەکان بۆ خوای پەروەردگار ﷻ، سیفەتەکانی خوای گەورە هەموو

ناوێك كە بە بەڵگەی قورئان و سوننەتی صەحیح سەلمابێت سیفەتێكی تێدایە بۆ خوای پەروەردگار، بۆ نموونە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ١٨١﴾(البقرة).

واتە: بەدڵنیاییەوە خوا بیسەر و زانایە؛ لەم ئایەتە پیرۆزەدا دوو ناو و دوو سیفەتی بۆ خوای پەروەردگار سەلماندووە بەوشێوەیەی شایستەی زاتی پیرۆز و گەورە و مەزنی خوایە كە بریتییە لە ناوەكانی ﴿سَمِيع﴾ و ﴿عَلِيم﴾، هەردوو سیفەتی بیستن و زانست بۆ خوای پەروەردگار.

سیفەتە جوانەكانی خوای پەروەردگار بە ئیعتباری لازمی بۆ زاتی پیرۆزی خوا دەبێتە سێ بەشەوە، ئیبن عوسەیمین دەڵێت: سیفەتەكانی خوا ﷻ بە ئیعتباری لازمی و لازم نەبوونی بۆ زاتی خوای پەروەردگار دەبێتە سێ بەشەوە:

یەكەم: سیفەتە زاتییەكان.

دووەم: سیفەتە كردارییەكان.

سێیەم: سیفەتی زاتی و كرداری بە دوو ئیعتبار.

سیفەتە زاتییەكان مەبەست ئەو سیفەتانەیە لازمە بە زاتی خواوە ﷻ كە بەردەوام لە ڕابردوو و لە ئایندەش بەو سیفەتە وەسف دەكرێت، وەك سیفەتی: ژیان (الحیاة)، زانست (العلم)، توانا (القدرة)، عیزەت (العزة)،

دانایی (الحکمة)، گەورەیی (العظمة)، گەورەیی شکۆ (الجلال)، پایەبەرزی (العلو)، و هاوشێوەی ئەو سیفەتانە، ناونراوە بە سیفەتی زاتی لەبەر ئەوەی لازمە بە زاتەوە، هەروەها هەردوو دەست و هەردوو چاو و ڕوو، ئەم سیفەتانە سیفەتە خەبەرییەکانیشیان پێ دەگوترێت.

سیفەتە کردارییەکان پەیوەستە بە ویستەوە، لازم نییە بە زاتییەوە نەبە ئیعتباری جۆرەکەی و نەبە ئیعتباری سیفەتەکە بە تەنها، بۆ نموونە بەرز و بڵندبوون بەسەر عەرشدا (الاستواء)، دابەزین بۆ ئاسمانی دونیا، هاتن بۆ حوکمکردن لە نێوان بەندەکان لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەم سیفەتانە سیفەتی کردارین و پەیوەستن بە ویستی خوای پەروەردگارەوە، ئەگەر بیەوێت ئەنجامی دەدات یان ئەنجامی نادات، ئەم سیفەتانە نوێن بە ئیعتباری جۆرەکەی و بە ئیعتباری سیفەتەکەش بە تەنها، بەرز و بڵندبوون بەسەر عەرشدا (الاستواء)، نەبووە دوای دروستکردنی عەرش نەبێت، دابەزین بۆ ئاسمانی دونیا، نەبووە دوای دروستکردنی ئاسمان نەبێت، و هاتنی ڕۆژی قیامەت نابێت هەتاکو قیامەت نەیەت.

ئەو سیفەتانەی زاتی و کردارین بریتین لەو سیفەتانەی ئەگەر بڕوانیتە جۆرەکەی دەزانیت خوای پەروەردگار بەردەوام لە ڕابردوو و لە ئایندەش بەو سیفەتە وەسف دەکرێت، لازمە بە زاتی، بەڵام ئەگەر تەنها بڕوانیتە خودی سیفەتەکە دەزانیت پەیوەستە بە ویستەوە و لازم نییە بە زاتییەوە، قسەکردنی خوای پەروەردگار بە نموونە بۆ ئەم

جۆرە هێنراوەتەوە، چونکە بەردەوام لە ڕابردوو و لە ئایندەش بەو سیفەتە وەسف دەکرێت و قسە دەکات، قسەکردنی لە کەماڵی پێویستە بۆ خوا ﷻ، و بە ئیعتباری قسەکردنێکی موعەیەن کە خوای پەروەردگار کەی بیەوێت قسە دەکات لە سیفەتە کردارییەکانە، چونکە بە ویستی پەروەردگار ﷻ بووە[1].

ئیبن عوسەیمین کۆمەڵێك یاسای بە سودی هێناوە، لەوانە: ناوەکانی خوای پەروەردگار ناون بە ئیعتباری دەلالەتی لەسەر زات، وەسفن بە ئیعتباری دەلالەتی لە ماناکان، بۆ نموونە: (السميع) ناوە بۆ زاتی خوای گەورە، سیفەتی بیستن لە خۆ دەگرێت و خوای پەروەردگار سیفەتی بیستنی هەیە.

ناوەکانی خوای پەروەردگار ئەگەر دەلالەت بێت بۆ وەسفێکی تێپەڕ (متعدي) سێ شت لە خۆی دەگرێت:

یەکەم: جێگیربوونی ئەو ناوە بۆ خوای باڵادەست.

دووەم: جێگیربوونی ئەو سیفەتەی تێیدایە بۆ خوای پەروەردگار.

سێیەم: جێگیربوونی ئەو حوکمەی لەخۆی گرتووە.

بۆ نموونە: (المحيي) واتە: زیندووکەرەوە، سیفەتێکی تێپەڕە، ئەوە ناوە بۆ خوای گەورە و سیفەتی زیندووکردنەوەی تێدایە، و حوکمی

---

(١). (مجموع فتاوى ورسائل)(١/١٢٤-١٢٥).

زیندووکردنەوەی بەندەکانیشی لەخۆ دەگرێت.

بەڵام ئەگەر ناوەکان بەڵگەبوون لەسەر وەسفێکی تێنەپەڕ (غیر متعد) دوو شت لەخۆ دەگرێت:

یەکەم: جێگیربوونی ئەو ناوە بۆ خوای پەروەردگار.

دووەم: جێگیربوونی ئەو سیفەتەی لەخۆی گرتووە.

بۆ نموونە: (الحي) واتە: زیندوو، ناوی (الحي) بۆ خوای بالادەست دەسەلمێنێت، و سیفەتی ژیانیشی بۆ جێگیر دەکات.

ناوەکان و سیفەتەکانی خوای پەروەردگار دەبێت بە دەقی قورئان و سوننەت جێگیربووبن، عەقڵ بواری نییە لەو پرسەدا.

بابەتی سیفەتەکانی پەروەردگار فراوانترە لە بابەتی ناوە جوان و پیرۆزەکانی.

هەموو ناوێك لە ناوە جوان و پیرۆزەکان سیفەتی تێدایە کە مانای ناوەکە دەلالەتە لەسەری.

نابێت هیچ سیفەتێك بۆ خوا جێگیر بکرێت کە بە بەڵگەی قورئان و سوننەتی صەحیح جێگیر نەبوو بێت[(١)].

عەباد دەڵێت: هەموو ناوەکانی خوای گەورە شیتەڵ دەبێت (مشتق)، ناوەکان سیفەتی لێوە دادەتاشرێت، هیچ ناوێکی نییە شیتەڵ

---

(١). بڕوانە (شرح القواعد المثلى).

نەبێت(جامد)، ناوەکانی خوا ﷻ بەڵگەن لەسەر سیفەتەکانی، چونکە هەموو ناوێك سیفەتێکی لێوە دەردەهێنرێت، بەڵام هەموو سیفەتێك ناوی لێوە دەرناهێنرێت، لە سیفەتەکانەوە ناو وەرناگیرێت بەڵام لە ناوەکانەوە سیفەتەکان وەردەگیرێت، هەندێك سیفەتی زاتی هەیە وەك دەست و ڕوو ناوی لێوە وەرناگیرێت، هەندێك سیفەت هەیە وەك (استهزاء، خداع، مكر) هاوشێوەی ئەوانە، ناوی لێوە وەرناگیرێت ناگوترێت: (مخادع، ماكر، مستزیء) لە ناوی خوایە، بەڵام لە بەرامبەر و هاوشێوەی کرداری بێباوەڕان بەو وەسفانە وەسف دەکرێت، و وشەی (یستحي) لە (حیي) وەرگیراوە[١].

  

---

(١). (شرح سنن أبي داود)(٢٦/١٧٨).

پێشەوا شافعی دەڵێت: **(لا يَسَعُ أَحَدٌ مِنْ خَلْقِ اللَّهِ كَانَتْ لَدَيْهِ الْحُجَّةُ، أَنَّ الْقُرْآنَ نَزَلَ بِهِ، وَصَحَّ عِنْدَهُ، بِقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ فِيمَا رُوِيَ عَنْهُ لا يَجُوزُ خِلافُهُ).**

واتە: ئەگەر ناو و سیفەتێکی جوانی خوای پەروەردگار بەڵگەی لەسەر جێگیربوو لە ئایەتەکانی قورئان، یان بە صەحیحی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ڕیوایەتکرابێت، کەس لە بەندە دروستکراوەکانی خوا بۆی نییە پێچەوانەی بکات.

هەر ناو و سیفەتێك بە ئایەتێکی قورئان یان فەرموودەیەکی صەحیحی پێغەمبەری خوا ﷺ جێگیر بووبێت، دەبێت موسڵمان بۆ خوای پەروەردگاریان بسەلمێنێت و نکۆڵی نەکات و لێکدانەوەی هەڵە و پێچەوانەی بۆ نەکات و ماناکانی لە کار نەخات (تعطيل)، و نەیچوێنێت بە دروستکراوەکانی، بەڵکو بەوشێوەیە دانی پێدا بنێت کە شایستەی زاتی پیرۆزی خوایە و لە ماناکانی قورئان و سوننەت و زمانی عەرەبی و لێکدانەوەی زانایانی پێشیندا لێکدانەوەی بۆ کراوە.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ٣٦﴾(الأحزاب).

واتە: بۆ هیچ باوەڕدارێکی پیاو و ئافرەت نییە سەرپێچی فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی بکەن، ئەگەر فەرمانێك بکەن نابێت هەڵبژاردەی تریان هەبێت جگە لە ملکەچی و گوێڕایەڵی، هەرکەسێك سەرپێچی فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی بکات بێگومان گومڕابووە گومڕاییەکی ئاشکرا.

دەفەرموێت: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُواْ ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٧﴾﴾(الحشر).

واتە: ئەوەی پێغەمبەری خوا فەرمانتان پێ دەکات جێبەجێی بکەن، ئەوەی نەهیتان لێ دەکات دەستی لێ هەڵبگرن و وازی لێ بهێنن، لە خوا بترسن و پارێزکاربن، دڵنیابن خوا سزای زۆر توندە بۆ ئەو کەسانەی سەرپێچی فەرمانەکانی خوا و پێغەمبەرەکەی دەکەن.

ئەو قسانەی پێشەوا شافعی ئەوە دەگەیەنێت فەرموودەی ئاحاد ئەگەر بسەلمێت صەحیحە دەکرێتە بەڵگە بۆ بیروباوەڕ، بەپێچەوانەی موعتەزیلەکان و هەموو ئەو کۆمەڵە لاڕێیانەی جیاکاری دەکەن لە نێوان فەرموودەی متەواتر و ئاحاد، دەڵێن: فەرموودەی ئاحاد ناکرێتە بەڵگە بۆ سەلماندن و جێگیرکردنی عەقیدە.

  

پێشەوا شافعی دەڵێت: **(فَإِنْ خَالَفَهُ بَعْدَ ثُبُوتِ الْحُجَّةِ عَلَيْهِ بِهِ، فَهُوَ بِاللَّهِ كَافِرٌ)**.

واتە: ئەگەر دوای باسکردن و ساغکردنەوەی بەڵگە بەسەرییەوە پێچەوانەی بکات و ئەو ناو و سیفەتە جوانە بۆ خوای پەروەردگار نەسەلمێنێت، ئەو کەسە بێباوەڕە بە خوا ﷻ.



پێشەوا شافعی دەڵێت: **(فَأَمَّا قَبْلَ ثُبُوتِ الْحُجَّةِ مِنْ جِهَةِ الْخَبَرِ فَمَعْذُورٌ بِالْجَهْلِ، لأَنَّ عِلْمَ ذَلِكَ لا يُدْرَكُ بِالْعَقْلِ، وَلا بِالرُّؤْيَةِ وَالْفِكْرِ، وَنَحْوُ ذَلِكَ إِخْبَارُ اللَّهِ إِيَّانَا)**.

واتە: بەڵام پێش ئەوەی بەڵگەی لە قورئان و سوننەتی صەحیح پێ بگات عوزری هەیە و لەبەر نەفامی کافر ناکرێت، چونکە زانستی ناو و سیفەتە جوانەکانی خوای پەروەردگار بە عەقڵ و تێگەیشتن و فیکر و تێڕامان دەرك ناکرێت و نازانرێت، هاوشێوەی ئەو حوکمانەی خوای پەروەردگار پێی ڕاگەیاندووین.

موسڵمانێك ئەگەر نەزانێت و بەڵگەی پێ نەگەیشتبێت و نەفامبێت بە ناو و سیفەتێکی خوای پەروەردگار عوزری هەیە لەبەر ئەوەی زانستی نەبووە بەو ناو و سیفەتە هەتا بۆ خوا ﷻ بسەلمێنێت و کافر نابێت، بەڵام دوای ئەوەی بەڵگەی پێدەگات لە ئایەتەکانی قورئان یان فەرموودە صەحیحەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ و تێی بگات و پێچەوانەی بکات و نکۆڵی بکات بێباوەڕ دەبێت.

ئەگەر لە پرسێکی بیروباوەڕی هەستیاری وەك ناو و سیفەتە جوانەکانی خوای پەروەردگار نەفامی عوزر بێت، بۆ پرسەکانی ئاین لە پێشترە.

  

پێشەوا شافعی دەڵێت: **(أَنَّهُ سَمِيعٌ).**

واتە: بێگومان خوای پەروەردگار بیسەرە، قسە و گوفتاری بەندەکانی دەبیستێت.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ١٢٧﴾(البقرة).

واتە: بەدڵنیاییەوە پەروەردگارمان تۆ بیسەری پاڕانەوەکانمانی و زانای بە کردەوەکانمان.

و دەفەرموێت: ﴿إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ٣٩﴾(إبراهيم).

واتە: بێگومان پەروەردگارم پاڕانەوەکانمان دەبیستێت و وەڵامی دەداتەوە.

ئەبوداود لە ئەبویونسی مەولای ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ریوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((سَمِعْتُ أبا هُرَيْرَةَ يَقْرَأُ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا وَإِذَا حَكَمۡتُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحۡكُمُواْ بِٱلۡعَدۡلِۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ٥٨﴾(النساء)، قالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَضَعُ إبْهامَهُ عَلى أُذُنِهِ، والَّتِي تَلِيها عَلى عَيْنِهِ، قالَ أبُو هُرَيْرَةَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقْرَؤُها ويَضَعُ إصْبَعَيْهِ، قالَ ابْنُ يُونُسَ: قالَ المُقْرِئُ:

يَعْنِي: إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ، يَعْنِي أَنَّ لِلَّهِ سَمْعًا وبَصَرًا، قالَ أَبُو داوُدَ: (وهَذا رَدٌّ عَلى الجَهْمِيَّةِ)).

واتە: گوێم لە ئەبوهورەیرە ﵁ بوو ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: بێگومان خوا فەرمانتان پێدەکات ڕاسپێردراوەکان (ئەمانەت) بدەنەوە بە خاوەنەکانیان، و ئەگەر حوکمتان کرد لە نێوان خەڵکدا دادگەرانە حوکم بکەن، بێگومان خوا بەباشترین شێوە ئامۆژگاریتان دەکات، بێگومان خوا بیسەری گوتەکانتان و بینەری کردەوەکانتانە، گوتی: پێغەمبەری خوام بینی ﷺ پەنجە گەورەکەی خستە سەر گوێی، پەنجەی گەواهیدانی خستە سەرچاوی؛ ئیبن یونسی موقری کە یەکێکە لە ڕاوییەکانی فەرموودەکە دەڵێت: مەبەستی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا﴾ ئەوەیە کە خوا (سمع)ی هەیە، و چاوی هەیە، ئەبوداود دەڵێت: ئەمە وەڵامە بۆ جەهمییەکان.

ئەم فەرموودەیە و هاوشێوەکانی بەڵگەن بۆ مەزهەبی ئەهلی سوننەت و جەماعەت کەلە ناو و سیفاتەکانی خوای پەروەردگار تێدەگەن و ماناکانیان لێك دەدەنەوە، بەڵام چۆنییەتی نازانن، واتە: دەڵێن: خوای پەروەردگار چاوی هەیە بەڵام بەو شێوەیەی کە شایستەی زاتی پیرۆزی پەروەردگارە، لە چاوی دروستکراوەکانی ناچێت، لێرە (سمع) ناتوانرێت لێکدانەوەی بە گوێ بۆ بکرێت چونکە

بە بەڵگەی صەحیح جێگیر نەبووە باسی گوێ بۆ خوای پەروەردگار بکات، کە وابوو نەنەفی دەکەین و نەبۆی دەسەلمێنین.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوۡجِهَا وَتَشۡتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسۡمَعُ تَحَاوُرَكُمَآۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٌ ١﴾(المجادلة).

واتە: بێگومان خوا قسەی ئەو ئافرەتەی بیست کە سەبارەت بە هاوسەرەکەی مشتومڕ و قسە و باسی لەگەڵدا کردیت، سکاڵای لای خوا دەکرد، خوا گفتوگۆکەتانی بیست، بێگومان خوا بیسەری گوفتار و بینەری کرداری بەندەکانییەتی و هیچی لێشاراوە نییە.

ئەحمەد و بوخاری بە موعەلەقی و نەسائی و ئیبن ماجە لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە رضي الله عنها ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((تبارَكَ الّذي وسِعَ سمعُهُ كلَّ شيءٍ، إنِّي لأسمعُ كلامَ خَولةَ بنتِ ثَعلبةَ ويخفى علَيَّ بعضُهُ، وَهيَ تشتَكي زَوجَها إلى رسولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم وَهيَ تقولُ: يا رسولَ اللَّهِ، أكَلَ شَبابي، ونثرتُ لَهُ بَطني، حتّى إذا كبُرَتْ سنِّي، وانقطعَ ولَدي، ظاهرَ منِّي، اللَّهمَّ إنِّي أشكو إليكَ، فما برِحَتْ حتّى نزلَ جِبرائيلُ بِهَؤلاءِ الآياتِ: ﴿قَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوۡجِهَا وَتَشۡتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسۡمَعُ تَحَاوُرَكُمَآۚ﴾)).

واتە: بەرز و مەزنە و خێر و چاکەی فراوان و بەردەوامە ئەو خوایەی کە بیستنی فراوانە و هەموو شتێکی گرتووەتەوە، من گوێم لە قسەی خەولەی کچی سەعلەبە دەگرت و هەندێکیم لێ شاراوەبوو، کە سکاڵای پیاوەکەی دەکرد لای پێغەمبەری خوا ﷺ و دەیگوت: ئەی پێغەمبەری خوا تەمەنی گەنجیم لەگەڵدا بەسەربرد، منداڵم زۆر بۆ هێناوە، هەتاکو پیربووم و ناتوانم منداڵ بهێنم، زیهار کردووە و جووتبوونی لەگەڵ قەدەغە کردووم و پێی گوتم: وەك دایکم وابیت، پەروەردگارا من سکاڵای مێردەکەم لای تۆ دەکەم، عائیشە دەڵێت: نەڕۆیشت هەتاکو جبریل ئەم ئایەتانەی دابەزاند: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَـٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ﴾.

زانایان بیستنی خوای پەروەردگاریان کردووەتە دوو بەشەوە:

یەکەم: بە مانای بیستن بۆ وەڵامدانەوەیە وەك دەفەرموێت: ﴿إِنَّ رَبِّي لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ٣٩﴾(إبراهیم).

واتە: بێگومان پەروەردگارم پاڕانەوەکانمان دەبیستێت و وەڵامی دەداتەوە.

ئەم جۆرە لە بیستن لە سیفەتە کردارییەکانی خوایە لەبەر ئەوەی پەیوەستە بەویستی خواوە.

دووەم: بە مانای بیستنی دەنگە و ئەمیش دەبێتە سێ بەشەوە:

یەکەم: مەبەست لێی هەڕەشەیە، وەك ئەم ئایەتە: ﴿لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ سَنَكْتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتْلَهُمُ ٱلْأَنْبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿١٨١﴾﴾(آل عیمران).

واتە: بێگومان خوا گوتەی ئەو کەسانەی بیست کە گوتیان: خوا هەژارە و ئێمە دەوڵەمەندین، ئەوەی گوتیان دەینوسین، ئەوەش دەنوسین کە پێغەمبەرانیان بە ناڕەوا دەکوشت، پێیان دەفەرمووین: سزای سوتێنەر بچێژن.

دووەم: مانای فراوانی و گشت بیستنی خوایە وەك دەفەرموێت: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَـٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا ﴿١﴾﴾(المجادلة).

واتە: بێگومان خوا قسەی ئەو ئافرەتەی بیست کە سەبارەت بە هاوسەرەکەی مشتومڕ و قسە و باسی لەگەڵدا کردیت.

سێیەم: بیستن بۆ پشتگیری و پاڵپشتی لێکردن وەك دەفەرموێت: ﴿قَالَ لَا تَخَافَآ إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ ﴿٤٦﴾﴾(طه).

واتە: خوای پەروەردگار بە پێغەمبەران موسا و هارونی فەرموو: مەترسن، دڵنیابن من لەگەڵتاندام یارمەتیتان دەدەم، ئەوەی ڕوودەدات لە نێوانتاندا دەبیستم و دەبینم و هیچم لێ شاراوە نییە؛ ئیبن عوسەیمین لە چەند شوێنێکی تەفسیرەکەی ئەو باسەی کردووە.

  

پێشەوا شافعی دەڵێت: **(وَأَنَّ لَهُ يَدَيْنِ، بِقَوْلِهِ:** ﴿بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ ﴿٦٤﴾﴾(المائدة)**)**.

واتە: بێگومان خوای پەروەردگار دوو دەستی هەیە، بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی دەفەرموێت: بەڵکو هەردوو دەستی خوا کراوەیە، دەبەخشێت چۆن بیەوێت.

تەواوی ئەو ئایەتەی کە پێشەوا شافعی هەندێکی هێناوە بۆ سەلماندنی ئەوەی خوای پەروەردگار دوو دەستی هەیە، دەفەرموێت: ﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌۚ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا۟ بِمَا قَالُوا۟ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُۚ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَـٰنًا وَكُفْرًاۚ وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِۚ كُلَّمَآ أَوْقَدُوا۟ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا ٱللَّهُۚ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًاۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٦٤﴾﴾(المائدة).

واتە: جوولەکە دەڵێن: دەستی خوا بەستراوە و نابەخشێت، خۆیان دەستیان بەستراوە و چروکن و نابەخشن، نەفرەتیان لێکرا بەهۆی ئەوەی کە گوتیان، بەڵکو هەردوو دەستی خوا کراوەیە، دەبەخشێت چۆن بیەوێت، بەدڵنیاییەوە زۆربەیان ئەوەی بۆت دابەزیوە لە پەروەردگارتەوە کە قورئانە زیاتر لە سنور دەریان دەکات و بێباوەڕیان دەکات، دوژمنایەتی و ڕق و کینەمان خستە نێوانیانەوە

هەتاکو ڕۆژی قیامەت، هەرکاتێك ئاگری شەڕیان هەڵبگیرساندایە خوا دەیکوژاندەوە، هەوڵی نانەوەی بشێوی و خراپەکاری دەدەن لەسەر زەوی، خوا خراپەکار و بشێویکارانی خۆش ناوێت.

دەفەرموێت: ﴿قَالَ يَـٰٓإِبۡلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسۡجُدَ لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّۖ أَسۡتَكۡبَرۡتَ أَمۡ كُنتَ مِنَ ٱلۡعَالِينَ ۝٧٥﴾(ص).

واتە: فەرمووی: ئەی ئیبلیس چی ڕێگرتبوو سوژدە ببەیت بۆ ئەو مرۆڤەی بە هەردوو دەستم دروستم کردووە، ئایا خۆت بە گەورە زانی یان پلەوپایەی خۆت لە سەروویەوە دەبینی.

دارمی و ئەبوالشیخ و لالەکائی لە ئیبن عومەرەوە ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((خلق أَرْبَعَةَ أَشْيَاءَ بِيَدِهِ: الْعَرْشُ، وَالْقَلَمُ، وعَدْنٌ، وَآدَمُ؛ ثُمَّ قَالَ لِسَائِرِ الْخَلْقِ كُنْ فكَانَ)).

واتە: خوا چوار شتی بەدەستی دروستکردووە: عەرش، قەڵەم، بەهەشتی جێگای مانەوەی باوەڕداران (جنة عدن)، و ئادەم، پاشان بە هەموو دروستکراوەکانی فەرموو: ببە، دروستبوون.

دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا خَلَقۡنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتۡ أَيۡدِينَآ أَنۡعَٰمٗا فَهُمۡ لَهَا مَٰلِكُونَ ۝٧١﴾(يس).

واتە: ئایا خەڵك نابینن بێگومان ئێمە حوشتر و مانگا و مەڕ و بزنمان بۆ دروستکردوون، ئەوان بوون بە خاوەنیان.

ئیبن عوسەیمین دەڵێت: ﴿مِّمَّا عَمِلَتۡ أَيۡدِينَآ أَنۡعَٰمٗا﴾ واتە: ئەو مەڕ و ماڵاتەمان بۆ دروستکردوون، مانای ئەوە نییە خوا ﷻ ئەو گیانلەبەرانەی بەدەستی دروستکردووە، ئەگەر مەبەستی ئەوە بووایە، و لە واقعدا بەوشێوەیە بووایە دەیفەرموو: (مما عملنا بأيدينا) وەك ئەوەی کاتێك باسی دروستکردنی ئادەم دەکات و بە ئیبلیس دەفەرموێت: ﴿مَا مَنَعَكَ أَن تَسۡجُدَ لِمَا خَلَقۡتُ بِيَدَيَّۖ ٧٥﴾(صٓ)، لەم ئایەتە دروستکردنی داوەتە پاڵ نەفسی خۆی و ئەوەی دروستکردووە بەدەستەکانی دروستی کردووە، بەڵام لەم ئایەتە: ﴿مِّمَّا عَمِلَتۡ أَيۡدِينَآ﴾ وەك ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێت: ﴿فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ ٣٠﴾(الشُّورَىٰ)، هاوشێوەکانی کە کردار دەدرێتە پاڵ دەست و مەبەست خودی مرۆڤە، لێرە خوا کرداری داوەتە پاڵ دەستەکانی، مەبەست نەفسی پیرۆزی خۆیەتی، لێرە دەفەرموێت: ﴿مِّمَّا عَمِلَتۡ أَيۡدِينَآ﴾ بە کۆ باسی دەکات، ئایا خوای پەروەردگار زیاتر لە دوو دەستی هەیە؟ وەڵام: نەخێر، خوا لە دوو دەست زیاتری نییە، ئەی لێرە بە کۆ باسی کردووە، کۆی کردووەتەوە لەبەر (المناسبة) چونکە لە (المثنى)دا بەوشێوەیە فەصیحە ئەگەر بدرێتە

پالْ كۆ بە كۆ بهێنرێت، وەك ئەو فەرموودەی خوا دەفەرموێت: ﴿إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَاۖ ٤﴾(التَّحۡرِيم)، بە كۆ دلْی هێناوە لە كاتێكدا مرۆڤ دلْێك زیاتری نییە.

  

پێشەوا شافعی دەڵێت: **(وَأَنَّ لَهُ يَمِينًا، بِقَوْلِهِ:** ﴿وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ ﴿٦٧﴾﴾(الزمر)**).**

واتە: بێگومان خوای پەروەردگار دەستی ڕاستی هەیە، بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی دەفەرموێت: ئاسمانەکان بەدەستی ڕاستی دەپێچێتەوە.

درێژەی ئەو ئایەتەی پێشەوا شافعی کردوویەتییە بەڵگە لەسەر ئەوەی خوای گەورە دەستی ڕاستی هەیە دەفەرموێت: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٧﴾﴾(الزمر).

واتە: هاوبەش بڕیاردەران خوایان وەك پێویست نەناسیوە و ڕێزیان نەگرتووە کاتێك پەرستراوی تریان لەگەڵ خوای تاك و تەنها دەپەرست، هەموو زەوی لە قیامەتدا لە مشتی خوادایە، ئاسمانەکان بەدەستی ڕاستی دەپێچێتەوە، زۆر بەرز و پاك و مەزنترە لەوشتانەی هاوبەش بڕیاردەران دەیکەن بە هاوبەشی.

بوخاری دەڵێت: ئەو ئایەتەی خوا دەفەرموێت: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ﴾ لە ئیبن مەسعودەوە رضي الله عنه دەڵێت: ((جَاءَ حَبْرٌ مِنَ الْأَحْبَارِ إِلَى رَسُولِ اللهِ صلى الله عليه وسلم فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، إِنَّا نَجِدُ أَنَّ اللهَ يَجْعَلُ السَّمَاوَاتِ عَلَى إِصْبَعٍ وَالْأَرَضِينَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالشَّجَرَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالْمَاءَ وَالثَّرَى عَلَى

إصْبَعٍ، وَسَائِرَ الْخَلَائِقِ عَلَى إِصْبَعٍ، فَيَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ، فَضَحِكَ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ تَصْدِيقًا لِقَوْلِ الْحَبْرِ، ثُمَّ قَرَأَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ مَطْوِيَّـٰتُۢ بِيَمِينِهِۦ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٧﴾﴾(الزمر).

واتە: زانایەك لە زاناكانی جوولەكە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی محمد، ئێمە لە تەوراتدا دەبینین خوای پەروەردگار ئاسمانەكان لەسەر پەنجەیەك دادەنێت، زەوییەكان لەسەر پەنجەیەك، درەختەكان لەسەر پەنجەیەك، ئاو و خاك لەسەر پەنجەیەك، هەموو دروستكراوەكانی تر لەسەر پەنجەیەك، دەفەرموێت: من پاشام، پێغەمبەری خوا ﷺ پێكەنی هەتاكو كاكیلەكانی دەركەوت، لەبەر بەڕاستی دانانی گوتەی زانا جوولەكەكە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَٱلسَّمَـٰوَٰتُ مَطْوِيَّـٰتُۢ بِيَمِينِهِۦ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٧﴾﴾.

بوخاری لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی كردووە دەڵێت: ((سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: يَقْبِضُ اللهُ الْأَرْضَ، وَيَطْوِي السَّمَاوَاتِ بِيَمِينِهِ، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ، أَيْنَ مُلُوكُ الْأَرْضِ)).

واتە: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: خوا زەوی لە مشت دەگرێت، ئاسمان بەدەستی ڕاستی دەپێچێتەوە، پاشان دەفەرموێت: من پاشام، پاشاكانی سەر زەوی لە كوێن؟.

مسلم لە عبداللەی کوڕی عەمرەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ((إِنَّ الْمُقْسِطِينَ عِنْدَ اللهِ عَلَى مَنَابِرَ مِنْ نُورٍ عَنْ يَمِينِ الرَّحْمَنِ عَزَّ وَجَلَّ، وَكِلْتَا يَدَيْهِ يَمِينٌ، الَّذِينَ يَعْدِلُونَ فِي حُكْمِهِمْ وَأَهْلِيهِمْ وَمَا وَلُوا)).

واتە: بێگومان کەسە دادگەرەکان لای خوای پەروەردگار لەسەر مینبەری بەرزن کەلە ڕووناکی دروستکراوە، لای دەستی ڕاستی خوای میهرەبان و بە بەزەیی، و هەردوو دەستی ڕاستە.

ئیبن باز و ئیبن عوسەیمین دەڵێن: لە بەخشین و فەزڵدا دەستی چەپی خوای میهرەبان وەك دەستی ڕاستە؛ ئیبن عوسەیمین دەڵێت: ئەگەر کەسێك بڵێت: لە سوننەتدا وەسفی هەردوو دەستی خوا سبحانه وتعالى بەڕاست هاتووە، سودی ئەوە چییە کە لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ﴾؟ وەڵامەکەی ئەوەیە: خوا دەستی ڕاست و دەستی چەپی هەیە، بەڵام کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەردوو دەستی ڕاستن (يمين) ماناکەی: لە (يُمن)نەوە هاتووە کە بریتییە لە بەرەکەت، بۆ ئەوەی گومانی کەموکورتی بڕەوێنێتەوە لە دەستەکەی تری، چونکە دەستی چەپ بەنیسبەت مرۆڤەوە وەك دەستی ڕاست نییە.

ئەبوداود لە ئیبن عومەرەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((يَطْوِي اللَّهُ السَّمَاوَاتِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، ثُمَّ يَأْخُذُهُنَّ بِيَدِهِ الْيُمْنَى، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ، أَيْنَ الْجَبَّارُونَ؟ أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ؟ ثُمَّ يَطْوِي الْأَرَضِينَ، ثُمَّ يَأْخُذُهُنَّ، قَالَ ابْنُ الْعَلَاءِ: بِيَدِهِ الْأُخْرَى، ثُمَّ يَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ، أَيْنَ الْجَبَّارُونَ؟ أَيْنَ الْمُتَكَبِّرُونَ)).

واتە: خوا سبحانه وتعالى ئاسمانەکان دەپێچێتەوە لە ڕۆژی قیامەتدا، پاشان بەدەستی ڕاستی دەیانگرێت، پاشان دەفەرموێت: من پاشام، زۆردار و لەخۆباییەکان لە کوێن؟ پاشان زەوییەکان دەپێچێتەوە و بەدەستەکەی تری دەیانگرێت و دەفەرموێت: من پاشام زۆردار و لە خۆباییەکان لە کوێن؟.

ئەم فەرموودەیە پێشەوا مسلمیش وەك پێشتر باسکراوە ڕیوایەتی کردووە لە بری بەدەستەکەی تری دەفەرموێت: بەدەستی چەپی، بەڵام ئەلبانی لە (الصحيحة)(٣١٣٦)دا ئاماژەی بەوە کردووە بە لەفزی چەپ: مونکەرە.

  

پێشەوا شافعی دەڵێت: **(وَأَنَّ لَهُ وَجْهًا، بِقَوْلِهِ:** ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ ۝٨٨﴾(القصص)، **وَقَوْلُهُ:** ﴿وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ۝٢٧﴾(الرحمن)**).**

واتە: خوای پەروەردگار ڕووی هەیە، بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی دەفەرموێت: هەموو شتێك تیادەچێت جگە لە خوای خاوەن ڕووی پیرۆز.

و ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: پەروەردگارت کە خاوەن ڕووی پیرۆزی شکۆدار و مەزنە، و خاوەن ڕێز و فەزڵی فراوانە دەمێنێتەوە و نامرێت.

ئیبن کەسیر دەڵێت: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ﴾ ئەمە هەواڵە کە خوای پەروەردگار هەربووە و دەمێنێتەوە و زیندووە و کاروباری بەندەکانی بەڕێوەدەبات، هەموو دروستکراوەکان دەمرن و ئەو زیندووە، وەك دەفەرموێت: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ۝٢٦ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ۝٢٧﴾(الرحمن)، تەعبیری بە ﴿وَجْهُ﴾ کردووە لە بری زاتی، لێرەش بە هەمان مانایە: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ﴾ واتە: هەموو شتێك تیادەچێت جگە لە خوا، موجاهید و سەوری دەڵێن: ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ﴾ واتە: هەموو شتێك تیادەچێت جگە لەوەی ئەنجامدراوە و تەنها مەبەست خوا ﷻ بووە، بوخاری ئەمە لە صەحیحەکەیدا هێناوە وەك ئیقرارێك؛ ئەم دوو ئایەتە چەندان ئایەت و

فەرموودەی صەحیحی تر بەڵگەی سەلماندنی ڕوویان تێدایە بۆ خوای پەروەردگار بەوشێوەیە شایستەیەتی، ئەهلی سوننەت کۆڕان لەسەر سەلماندنی ڕوو بۆ خوا، چونکە قورئان و سوننەتی صەحیح بەڵگەن لەسەر ئەوە، بوخاری لە جابرەوە ڕضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لَمَّا نَزَلَ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ: ﴿قُلْ هُوَ ٱلْقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ﴾ قَالَ: أَعُوذُ بِوَجْهِكَ، ﴿أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ﴾﴿٦٥﴾ قَالَ أَعُوذُ بِوَجْهِكَ، فَلَمَّا نَزَلَتْ: ﴿أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ ۗ ﴿٦٥﴾﴾(الأنعام)، قَالَ: هَاتَانِ أَهْوَنُ أَوْ أَيْسَرُ)).

واتە: کاتێك ئەم ئایەتە دابەزییە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ، پێی فەرموو: بڵێ: خوا دەتوانێت سزاتان بۆ بنێرێت لە لای سەرەوەتان، فەرمووی: پەنا دەگرم بە خوای خاوەنی ڕووی پیرۆز، یان لە ژێر پێتانەوە، فەرمووی: پەنا دەگرم بە خوای خاوەنی ڕووی پیرۆز، کاتێك ئەمە دابەزی: و سزا و تاڵاوی ئێش و ئازار بە دەستی یەك بچێژن، فەرمووی: ئەم دووانەیان ئاسانترە.

ئیبن کەسیر دەڵێت: خوا لەم ئایەتەدا وەسفی ڕووی پیرۆزی خۆی کردووە بەوەی ﴿ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ﴾ واتە: شایانی ئەوەیە

شکۆمەند و پیرۆز ڕابگیرێت و سەرپێچی نەکرێت، گوێڕایەڵی بکرێت و پێچەوانەی فەرمانەکانی نەکرێت، وەك ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ ٢٨﴾(الكهف)، و ئەو ئایەتەی باسی ئەو کەسانە دەکات کە دەبەخشن دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا نُطۡعِمُكُمۡ لِوَجۡهِ ٱللَّهِ ٩﴾(الإنسان).

  

پێشەوا شافعی دەڵێت: **(وَأَنَّ لَهُ قَدَمًا، بِقَوْلِهِ ﷺ: ((حَتَّى يَضَعَ الرَّبُّ فِيهَا قَدَمَهُ))، يَعْنِي: فِي جَهَنَّمَ).**

واتە: بێگومان پەروەردگار پێی هەیە، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: هەتاکو خوای پەروەردگار پێی تێ دەخات، واتە: نێو دۆزەخ.

ئەم فەرموودەیەی کردوویەتییە بەڵگە لەسەر سەلماندنی پێ بۆ پەروەردگار، بوخاری لە ئەنەسەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((يُلْقَى فِي النَّارِ ﴿وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ ٣٠﴾(ق)، حَتَّى يَضَعَ قَدَمَهُ، فَتَقُولُ: قَطْ قَطْ)).

واتە: کەسانێك فڕێدەدرێنە ئاگرەوە، پرسیاری لێ دەکرێت ئایا پڕ بوویت؟ لە وەڵامدا دەڵێت: ئایا کەسی تر هەیە فڕێبدرێتە دۆزەخەوە، هەتاکو خوا سبحانه وتعالى پێی تێدەخات، دەڵێت: بەسە، بەسە.

مسلم لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((لَا تَزَالُ جَهَنَّمُ يُلْقَى فِيهَا: ﴿وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ ٣٠﴾(ق)، حَتَّى يَضَعَ رَبُّ الْعِزَّةِ فِيهَا قَدَمَهُ، فَيَنْزَوِيَ بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ وَتَقُولُ: قَطْ قَطْ بِعِزَّتِكَ وَكَرَمِكَ، وَلَا يَزَالُ فِي الْجَنَّةِ فَضْلٌ حَتَّى يُنْشِئَ اللهُ لَهَا خَلْقًا فَيُسْكِنَهُمْ فَضْلَ الْجَنَّةِ)).

واتە: بەردەوام دۆزەخ دەڵێت: ﴿هَلۡ مِن مَّزِيدٍ﴾، هەتاكو پەروەردگاری بە عیزەت پێی تێدەخات، دێتەوە یەك، دەڵێت: بەسە بەسە، بە عیزەت و كەرەمت، بەردەوام لە بەهەشتدا شوێنی زیادە هەیە هەتاكو خوا كەسانێكی بۆ دروست دەكات و لەو شوێنە زیادانەی بەهەشت نیشتەجێیان دەكات.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَوۡمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمۡتَلَأۡتِ وَتَقُولُ هَلۡ مِن مَّزِيدٍ ٣٠﴾(ق).

واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا بە دۆزەخ دەڵێین: ئایا پڕ بوویت، لە وەڵامدا دەڵێت: ئایا كەسی تر هەیە فڕێبدرێتە دۆزەخەوە.

ئیبن كەسیر دەڵێت: خوا ﷻ باسی ئەوە دەكات لە قیامەتدا بە دۆزەخ دەفەرموێت: ئایا پڕ بوویت؟ لەبەر ئەوەی بەڵێنی پێداوە پڕی دەكات لە جن و مرۆڤ، خوا فەرمان دەكات ئەوانەی دۆزەخین، فڕێدەدرێنە دۆزەخەوە، لە وەڵامدا دەڵێت: ﴿هَلۡ مِن مَّزِيدٍ﴾ واتە: ئایا كەسی زیاتر ماوە؟ ئەمە ڕواڵەتی سیاقەی ئایەتەكەیە، فەرموودەكان بەڵگەن لەسەر ئەوە.

  

پێشەوا شافعی دەڵێت: **(وَأَنَّهُ يَضْحَكُ مِنْ عَبْدِهِ الْمُؤْمِنِ، بِقَوْلِهِ ﷺ: لِلَّذِي قُتِلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ: ((أَنَّهُ يَلْقَى اللَّهَ وَهُوَ يَضْحَكُ إِلَيْهِ))**.

واتە: پەروەردگار پێدەکەنێت بە بەندە باوەڕدارەکەی، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەو کەسەی لە پێناوی خوادا کوژراوە، دەفەرموێت: دەگاتە دیداری خوا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى پێدەکەنێت بۆی.

سیفەتی پێکەنین بۆ خوای پەروەردگار لە ئایەتە پیرۆزەکانی قورئاندا نەهاتووە، بەڵام بە چەند فەرموودەیەکی صەحیحی پێغەمبەری خوا ﷺ سەلماوە بەوشێوەیەی شایستەی خوای باڵادەستە، بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: **((يَضْحَكُ اللَّهُ إِلَى رَجُلَيْنِ، يَقْتُلُ أَحَدُهُمَا الْآخَرَ، كِلَاهُمَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ، فَقَالُوا: كَيْفَ؟ يَا رَسُولَ اللَّهِ! قَالَ: يُقَاتِلُ هَذَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ فَيُسْتَشْهَدُ، ثُمَّ يَتُوبُ اللَّهُ عَلَى الْقَاتِلِ فَيُسْلِمُ، فَيُقَاتِلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ فَيُسْتَشْهَدُ))**.

واتە: خوا سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى پێدەکەنێت بۆ دوو پیاو، یەکێکیان ئەوی تریان

دەکوژێت، و هەردووکیان دەچنە بەهەشتەوە، گوتیان: چۆن ئەی پێغەمبەری خوا؟!، فەرمووی: ئەمەیان لە پێناوی ڕێگای خوا جیهاد دەکات و شەهید دەبێت، پاشان بکوژەکە تەوبە دەکات و خوای پەروەردگار تەوبەکەی قەبوڵ دەکات و موسڵمان دەبێت، لە پێناوی ڕێگای خوا ﷻ تێدەکۆشێت و جیهاد دەکات و شەهید دەبێت.

مسلم لە جابری کوڕی عبداللەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتی کردووە دەڵێت پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((فَتُدْعَى الْأُمَمُ بِأَوْثَانِهَا وَمَا كَانَتْ تَعْبُدُ الْأَوَّلَ فَالْأَوَّلَ، ثُمَّ يَأْتِينَا رَبُّنَا بَعْدَ ذَلِكَ، فَيَقُولُ: مَنْ تَنْظُرُونَ؟ فَيَقُولُونَ: نَنْظُرُ رَبَّنَا، فَيَقُولُ: أَنَا رَبُّكُمْ، فَيَقُولُونَ :حَتَّى نَنْظُرَ إِلَيْكَ فَيَتَجَلَّى لَهُمْ يَضْحَكُ)).

واتە: هەمووان بە ناوی ئەو بت و پەیکەرەوە بانگ دەکرێت کە پەرستوویەتی کۆمەڵ دوای کۆمەڵ، پاشان خوای پەروەردگارمان دێت بۆ لامان، دەفەرموێت: چاوەڕوانی کێ دەکەن؟ دەڵێن: چاوەڕوانی پەروەردگارمان دەکەین، دەفەرموێت: من پەروەردگارتانم، دەڵێن: با بۆت بڕوانین، خوای گەورە خۆی پیشانی باوەڕداران دەدات و پێدەکەنێت لە قیامەتدا.

ئەحمەد لە شێخێکی بەنوعامرەوە ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إِنَّ اللهَ يُنْشِئُ السَّحَابَ، فَيَنْطِقُ أَحْسَنَ الْمَنْطِقِ، وَيَضْحَكُ أَحْسَنَ الضَّحِكِ)).

واتە: خوای پەروەردگار هەوری قورس پڕ باران دروست دەکات، و قسە دەکات جوانترین قسە، و پێدەکەنێت جوانترین پێکەنین.

ئەحمەد و ئیبن ماجە لە ئەبوڕەزینەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە و ئەلبانی بە حەسەنی داناوە، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((ضَحِكَ رَبُّنَا مِنْ قُنُوطِ عِبَادِهِ وَقُرْبِ غِيَرِهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَوَ يَضْحَكُ الرَّبُّ؟، قَالَ: نَعَمْ، قُلْتُ: لَنْ نَعْدِمَ مِنْ رَبٍّ يَضْحَكُ خَيْرًا)).

واتە: پەروەردگارمان پێدەکەنێت لە بێئومێدی بەندەکانی و نزیکی گۆڕانی حاڵی بۆ باشتر، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا پەروەردگار پێدەکەنێت، فەرمووی: بەڵێ، گوتم: بێبەش نابین لە خێری پەروەردگارێك پێ بکەنێت.

  

پێشەوا شافعی دەڵێت: **(وَأَنَّهُ يَهْبِطُ كُلَّ لَيْلَةٍ إِلَى سَمَاءِ الدُّنْيَا، يُخْبِرُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِذَلِكَ).**

واتە: بێگومان خوای پەروەردگار هەموو شەوێك دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا، پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ئەوەی کردووە و هەواڵی لەبارەوە داوە.

پێشەوا شافعی ئاماژە بۆ ئەو فەرموودەیە دەکات کە بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((يَنْزِلُ رَبُّنا تَبارَكَ وتعالى كُلَّ لَيْلَةٍ إلى السَّماءِ الدُّنْيا حِينَ يَبْقى ثُلُثُ اللَّيْلِ الآخِرُ، يقولُ: مَن يَدْعُونِي، فأسْتَجِيبَ له؟ مَن يَسْأَلُنِي فأُعْطِيَهُ؟ مَن يَستَغْفِرُنِي فأغْفِرَ له؟)).

واتە: پەروەردگارمان هەموو شەوێك دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دونیا کاتێك شەو سێیەکی کۆتایی دەمێنێتەوە، دەفەرموێت: کێ لێم دەپاڕێتەوە، هەتا وەڵامی بدەمەوە؟، کێ داوام لێ دەکات پێی ببەخشم؟، کێ داوای لێخۆشبوون و پۆشینی تاوانەکانی دەکات، هەتا لێی خۆشببم و تاوانەکانی بپۆشم.

ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەهلی سوننەیە لەسەر ئەوەی خوای پەروەردگار هەموو شەوێك دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا بەڵام

چۆنییەتییەکە نازانرێت، پرسیاری دابەزینی خوای پەروەردگار بۆ ئاسمانی دونیا کراوە لە ئەبوحەنیفە رحمه الله دەڵێت: (يَنْزِلُ بِلَا كَيْفٍ)[1].

واتە: دادەبەزێت بەبێ ئەوەی چۆنییەتییەکەی بزانین.

شافعی رحمه الله دەڵێت: (أَنَّ اللَّهَ تَعَالَى يَنْزِلُ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا كَيْفَ شَاءَ)[2].

واتە: بێگومان خوای پەروەردگار دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا چۆن بیەوێت.

ئیسحاقی کوڕی منصوری کەوسج دەڵێت: (قُلْتُ لِأَحْمَدَ يَعْنِي ابْنَ حَنْبَلٍ: يَنْزِلُ رَبُّنَا سبحانه وتعالى كُلَّ لَيْلَةٍ، حِينَ يَبْقَى ثُلُثُ اللَّيْلِ الْأَخِيرِ إِلَى سَمَاءِ الدُّنْيَا، أَلَيْسَ تَقُولُ بِهَذِهِ الْأَحَادِيثِ؟ وَيَرَاهُ أَهْلُ الْجَنَّةِ يَعْنِي رَبَّهُمْ عز وجل؟ وَلَا تُقَبِّحُوا الْوَجْهَ فَإِنَّ اللَّهَ عز وجل خَلَقَ آدَمَ عَلَى صُورَتِهِ، وَاشْتَكَتِ النَّارُ إِلَى رَبِّهَا عز وجل حَتَّى وَضَعَ فِيهَا قَدَمَهُ، وَإِنَّ مُوسَى لَطَمَ مَلَكَ الْمَوْتِ قَالَ أَحْمَدُ: كُلُّ هَذَا صَحِيحٌ، قَالَ إِسْحَاقُ: هَذَا صَحِيحٌ، وَلَا يَدْفَعُهُ إِلَّا مُبْتَدِعٌ أَوْ ضَعِيفُ الرَّأْيِ)[3].

واتە: بە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلم گوت: پەروەردگارمان سبحانه وتعالى دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا هەموو شەوێك، کاتێك سێیەکی کۆتایی شەو

---

(١). (شرح العقيدة الطحاوية)(٢٦٩/١).

(٢). (إثبات صفة العلو)(١٨١).

(٣). (الشريعة للآجري)(١١٢٧/٣).

دەمێنێت، ئایا تۆ ئەم فەرموودانە وەردەگریت؟ و ئەهلی بەهەشت پەروەردگاریان دەبینن، جنێو بە کەسێك مەڵێن و پێی بڵێن: چەندە ڕووت ناشرینە، چونکە خوا ئادەمی لەسەر (صورتە) دروستکردووە، و ئاگر سکاڵای کرد لای پەروەردگاری هەتاکو پەروەردگار پێی تێخست، و پێغەمبەر موسا زللەیەکی لە فریشتەی ڕۆح کێشانداوە، ئەحمەد گوتی: هەموو ئەمانە صەحیحن، ئیسحاق دەڵێت: ئەمانە صەحیحن کەسێکی موبتەدیع یان بیروبۆچوون لاواز نەبێت ڕەتی ناکاتەوە.

  

پێشەوا شافعی دەڵێت: **(وَأَنَّهُ لَيْسَ بِأَعْوَرَ، لِقَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ إِذْ ذَكَرَ الدَّجَّالَ، فَقَالَ: ((إِنَّهُ أَعْوَرُ، وَإِنَّ رَبَّكُمْ لَيْسَ بِأَعْوَرَ)).**

واتە: بێگومان پەروەردگار ﷻ یەك چاوی کوێر نییە، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی دەجالی کرد و فەرمووی: بێگومان دەجال چاوێکی کوێرە، دڵنیابن پەروەردگارتان چاوێکی کوێر نییە.

بوخاری و مسلم لە ئەنەسەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((ما بُعِثَ نَبِيٌّ إلّا أَنْذَرَ أُمَّتَهُ الأعْوَرَ الكَذّابَ، ألا إنَّه أعْوَرُ، وإنَّ رَبَّكُمْ ليس بأعْوَرَ، وإنَّ بيْنَ عَيْنَيْهِ مَكْتُوبٌ كافرٌ)).

واتە: هیچ پێغەمبەرێك نییە ڕەوانەکرابێت ئیللا ئوممەتەکەی ترساندووە و ئاگادارکردووەتەوە لە دەجال کە یەك چاوی کوێرە، پەروەردگاری ئێوە چاوێکی کوێر نییە، لە نێو چاوانی دەجال نوسراوە (ك،ف،ر).

زانایانی سوننەت ئەم فەرموودەیە دەکەنە بەڵگە لەسەر ئەوەی خوای پەروەردگار دوو چاوی هەیە کە شایستەی زاتی پیرۆزییەتی، ئەوەش بۆچوونی ئیبن باز و ئەلبانی و ئیبن عوسەیمینە لە زانایانی ئەم سەردەمە، ئەبوداود لە ئەبویونسی مەولای ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە و ئەلبانی بە صەحیحی داناوە، دەڵێت: ((سَمِعْتُ أبا هُرَيْرَةَ يَقْرَأُ هَذِهِ الآيَةَ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُوا۟ بِٱلْعَدْلِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ نِعِمَّا

يَعِظُكُم بِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴿٥٨﴾(النساء)، قالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَضَعُ إبْهامَهُ عَلَى أُذُنِهِ، والَّتِي تَلِيها عَلى عَيْنِهِ، قالَ أبُو هُرَيْرَةَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقْرَؤُها ويَضَعُ إصْبَعَيْهِ، قالَ ابْنُ يُونُسَ: قالَ المُقْرِئُ: يَعْنِي: إنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ، يَعْنِي أنَّ لِلَّهِ سَمْعًا وبَصَرًا، قالَ أبُو داوُدَ: (وهَذا رَدٌّ عَلى الجَهْمِيَّةِ)).

واتە: گوێم لە ئەبوهورەیرە رضي الله عنه بوو ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: بێگومان خوا فەرمانتان پێدەکات ڕاسپێردراوەکان (ئەمانەت) بدەنەوە بە خاوەنەکانیان، و ئەگەر حوکمتان کرد لە نێوان خەڵکدا دادگەرانە حوکم بکەن، بێگومان خوا بەباشترین شێوە ئامۆژگاریتان دەکات، بێگومان خوا بیسەری گوتەکانتان و بینەری کردەوەکانتانە، گوتی: پێغەمبەری خوام بینی ﷺ پەنجە گەورەکەی خستە سەر گوێی، پەنجەی گەواهیدانی خستە سەرچاوی؛ ئیبن یونسی موقری کە یەکێکە لە ڕاوییەکانی فەرموودەکە دەڵێت: مەبەستی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا﴾ ئەوەیە کە خوا (سمع)ی هەیە، و چاوی هەیە، ئەبوداود دەڵێت: ئەمە وەڵامە بۆ جەهمییەکان.

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا وَوَحۡيِنَا وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ ﴿٣٧﴾(هود).

واتە: کەشتییەك دروست بکە بە پێش چاوی ئێمەوە و بە فەرمان و وەحی ئێمە، گفتوگۆم لەگەڵدا مەکە بۆ لێخۆشبوون لە ئەو کەسانەی ستەمیان کرد و باوەڕیان نەهێنا، چونکە بێگومان هەموویان ژێر ئاو دەکەون و دەخنکێن.

تەبەری دەڵێت: ﴿بِأَعْيُنِنَا﴾ واتە: بە پێش چاوی خواوە و بە فەرمانی ئەو کەشتییەکە دروست بکە بەوشێوەیەی فەرمانت پێ دەکەین؛ ئیبن عوسەیمین دەڵێت: مەزهەبی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ئەوەیە کە خوای پەروەردگار دوو چاوی هەیە، پێیان دەڕوانێت بەوشێوەیەی شایستەی زاتی پیرۆزییەتی، ئەوە لە سیفەتە زاتییەکانە، ئەگەر کەسێك بڵێت: ﴿بِأَعْيُنِنَا﴾ بە کۆ هاتووە وەڵامی ئەوە چییە؟ دەڵێین: کەمترین کۆ بە ڕەهایی یان بە وابەستەکراوی بریتییە لە دوو.

  

پێشەوا شافعی دەڵێت: **(وَأَنَّ الْمُؤْمِنِينَ يَرَوْنَ رَبَّهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِأَبْصَارِهِمْ كَمَا يَرَوْنَ الْقَمَرَ لَيْلَةَ الْبَدْرِ).**

واتە: بێگومان باوەڕداران پەروەردگاریان لە ڕۆژی قیامەتدا بە چاویان دەبینن، وەك چۆن مانگی چواردە دەبینن.

بینینی پەروەردگار حەقە بۆ باوەڕداران لە بەهەشتدا زانایان دەڵێن: فەرموودە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ گەیشتووەتە ئاستی تەواتر لەسەر ئەو پرسە، بوخاری و مسلم لە ئەبوسەعیدی خودرییەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((قُلْنا: يا رَسُولَ اللهِ هَلْ نَرى رَبَّنا يَوْمَ القِيامَةِ ؟ قالَ: هَلْ تُضارُونَ فِي رُؤْيَةِ الشَّمْسِ والقَمَرِ إذا كانَتْ صَحْوًا؟، قُلْنا: لاَ، قالَ: فَإنَّكُمْ لاَ تُضارُونَ فِي رُؤْيَةِ رَبِّكُمْ يَوْمَئِذٍ، إلا كَما تُضارُونَ فِي رُؤْيَتِهِما)).

واتە: گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا پەروەردگارمان لە ڕۆژی قیامەتدا دەبینین؟ فەرمووی: ئایا کەس کێشە و پاڵەپەستۆتان لەسەر دادەنێت بۆ بینینی خۆر و مانگ ئەگەر ئاسمان ساماڵ بێت؟ گوتمان: نەخێر، فەرمووی بەوشێوەیە لە ڕۆژی قیامەتدا کەستان هیچ گرفت و پاڵەپەستۆیەکی لەسەر دروست نابێت بۆ بینینی پەروەردگاری.

تەحاوی دەڵێت : (والرُّؤْيَةُ حَقٌّ لِأهْلِ الجَنَّةِ، بِغَيْرِ إحاطَةٍ ولا كَيْفِيَّةٍ، كَما نَطَقَ بِهِ كِتابُ رَبِّنا: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ

﴿٢٣﴾(القيامة)، وتَفْسِيرُهُ عَلى ما أرادَ اللَّهُ تَعالى وعَلِمَهُ، وكُلُّ ما جاءَ فِي ذَلِكَ مِنَ الحَدِيثِ الصَّحِيحِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَهُوَ كَما قالَ)[1].

واتە: بینینی خوا ﷻ حەقە بۆ ئەهلی بەهەشت لە قیامەتدا، بەبێ دەورەدان و چۆنییەتی، وەك لە كتێبەكەی پەروەردگارماندا فەرموویەتی: كۆمەڵە ڕوخسارێك لە ڕۆژی قیامەتدا جوانن و دەدرەوشێنەوە و دەڕواننە پەروەردگاریان؛ بەوشێوەیە تەفسیر دەكرێت كە خوا ﷻ ویستوویەتی و زانیویەتی و هەرچی لەوبارەیەوە لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە بەوشێوەیەیە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی.

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿وُجُوهٌ يَوۡمَئِذٖ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٞ ﴿٢٣﴾﴾(القيامة).

واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا كۆمەڵە ڕوخسارێك دەدرەوشێنەوە، و دەڕواننە پەروەردگاریان.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿لِّلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ ٱلۡحُسۡنَىٰ وَزِيَادَةٞۖ ﴿٢٦﴾﴾(يونس).

---

(١). (شرح العقيدة الطحاوية)(١٥٣/١).

واتە: بۆ ئەوانەی کە چاکەکارن پاداشتی چاکە هەیە کە نازونیعمەتی بەهەشتە، زیاتر لەوەش پاداشتیان بۆ چەندجارە دەکرێت و لە هەموو ئەوانەش باشتر بینینی پەروەردگارە.

مسلم لە صوهەیبی کوڕی سینانی ڕۆمییەوە ﵁ ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إذا دَخَلَ أهْلُ الجَنَّة الجَنَّةَ، قالَ: يَقولُ اللهُ تَبارَكَ وتَعالى: تُرِيدُونَ شَيْئًا أزِيدُكُمْ؟ فَيَقُولُونَ: ألَمْ تُبَيِّضْ وُجُوهَنا؟ ألَمْ تُدْخِلْنا الجَنَّةَ، وتُنَجِّنا مِنَ النّارِ؟ قالَ: فَيَكْشِفُ الحِجابَ، فَما أُعْطُوا شَيْئًا أحَبَّ إلَيْهِمْ مِنَ النَّظَرِ إلى رَبِّهِمْ ﷻ؛ ثُمَّ تَلا هَذِهِ الآيَةَ: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ۖ ﴿٢٦﴾﴾)).

واتە: ئەگەر بەهەشتییەکان چوونە بەهەشتەوە، خوا ﷻ پێیان دەفەرموێت: هیچ شتێکتان دەوێت بۆتانی زیاد بکەم ؟ دەڵێن: ئایا ڕووت سپی نەکردووین ؟ ئایا بەهەشتت پێ نەبەخشیوین ؟ ئایا لە ئاگری دۆزەخ ڕزگارت نەکردووین ؟ دەفەرموێت: پەردە لادەدرێت، پەروەردگاریان دەبینن، هیچ شتێکیان پێ نەبەخشراوە پێیان خۆشتربێت لە ڕوانینیان بۆ پەروەردگاریان ﷻ، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ ۖ﴾.

خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴿٢٢﴾ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٢٣﴾﴾(المطففين).

واتە: بێگومان چاکەکاران لە نازونیعمەت و خۆشگوزەرانیدان، لەسەر تەخت و ڕاخەر دەڕوانن.

ئیبن کەسیر دەڵێت: ﴿إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٍ﴾، واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا لە نازونیعمەتی نەبڕاوەدان، و فەزڵی خوا ﷻ داپۆشیون، ﴿عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ﴾ لەسەر تەخت و ڕاخەرەکانیان کە سێبەری لەسەرە، ﴿يَنظُرُونَ﴾ گوتراوە: مانای ئەوەیە دەڕواننە موڵك و ئەو فەزڵ و خێرەی خوا پێی بەخشیون، کە لەناوناچێت و کۆتایی نایەت، گوتراوە: مانای ﴿عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ﴾ دەڕواننە خوا ﷻ، و ئەمە لە بەرانبەر ئەوەیە کە خوا وەسفی خراپەکاری کرد و فەرمووی: ﴿كَلَّآ إِنَّهُمۡ عَن رَّبِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ ١٥﴾(المطففين)، باسی ئەوانەی کرد دەڕواننە پەروەردگاریان لەسەر ڕاخەرە سێبەردارەکەیانەوە.

ڕەبیعی کوڕی سلیمان دەڵێت: ڕۆژێك لای شافعی بووم، نوسراوێکی لە صەعیدەوە ـ شوێنێکە لە وڵاتی میسر ـ بۆ هات، پرسیاریان لێکرد دەربارەی ئەو ئایەتەی خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿كَلَّآ إِنَّهُمۡ عَن رَّبِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ ١٥﴾(المطففين)، شافعی ؒ لە وەڵامیدا نوسی:

کاتێك خوا لەبەر تووڕەیی کەسانێکی بێبەشکرد لە بینینی، بەڵگەی ئەوەی تێدایە کەسانێك لەبەر ڕەزامەندی لێیان دەیبینن[(١)].

ئەلبانی دەڵێت: فەرموودە دەربارەی سەلماندنی بینینی خوای پەروەردگار لەلایەن باوەڕدارانەوە زۆر زۆرە هەتاکو گەیشتووەتە ئاستی تەواتر، هەندێك لە پێشەواکان جەختیان لەوە کردووەتەوە، لەوانە ئیبن ئەبوالعزی کە شەرحی (عەقیدەی تەحاوی) کردووە و هەندێك لەو فەرموودانەی هێناوە پاشان دەڵێت: ئەو فەرموودانەی باسی بینینی خوا ﷻ دەکەن نزیکەی سی هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕیوایەتیان کردووە، هەرکەسێك شارەزای هەبێت دەربارەیان دڵنیا دەبێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی، پاشان دەڵێت: چواندنی بینینی خوا ﷻ بە بینینی خۆر و مانگ چواندنی خوا ﷻ نییە، بەڵکو چواندنی بینینە بە بینین، بەڵام بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە خوا لە بەرزییە لە سەرووی دروستکراوەکانی، ئەگەرنا ناشێت بینین ڕووبدات بەبێ چاوپێکەوتن؟ هەرکەسێك بڵێت: دەبینرێت بەڵام لە ئاراستەیەکدا نابینرێت، بابە عەقڵ و ژیری خۆیدا بچێتەوە!! یان ئەوەیە لووتبەرزە و عەقڵی خۆی بەشت دەزانێت، یان لە عەقڵیدا

---

(١). (تفسير الإمام الشافعي)(٣/١٤٢٩).

شتێك هەیە، چونكە ئەگەر بڵێت: دەبینرێت نەلە پێشی ئەو كەسەی كە دەیبینێت و نەلە پشتی و نەلە لای ڕاستی و نەلە لای چەپی، نەلە سەرەوەی و نەلە خوارەوەی، هەموو كەسێك كە فیترەتی سەلامەت بێت ئەوەی لێ ببیستێت ڕەدی دەداتەوە.

دەڵێم: بەڵام بینینی خوا ﷻ لە دونیا، پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەكی صەحیحدا باسی ئەوەی كردووە: كەس لە ئێمە خوا ﷻ نابینێت هەتاكو نەمرێت، مسلم ڕیوایەتی كردووە، لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، بەڵگە نەهاتووە بینینی بسەلمێنێت، بەڵكو بە صەحیحی لێیەوە هاتووە ئاماژەی ئەوەی تێدایە خوای ﷻ نەبینیوە، كاتێك پرسیاری لێ دەكەن دەفەرموێت: ((نُورٌ أنّى أراه))، واتە: نورە چۆن بیبینم؛ لەگەڵ ئەوەشدا لە هەردوو صەحیحەكەدا خاتوو عائیشە رضي الله عنها جەخت لەوە دەكاتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ خوای ﷻ نەبینیوە، ئەمەش بنەمایە و پێویستە دەستی پێوە بگیرێت[1].

ئایا بێباوەڕان و دووڕووەكان خوا ﷻ لە قیامەتدا دەبینن، لەو فەرموودەی بوخاری و مسلم لە ئەبوهورەیرەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان كردووە كە باس لە ڕۆژی قیامەت و حاڵی خەڵك دەكات كە چۆن

---

(١). (العقيدة الطحاوية شرح وتعليق)(ص٢٩-٣١).

شوێنی پەرستراوەکانیان دەکەون، دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((وتَبْقى هَذِه الأُمَّةُ فِيها مُنافِقُوها، فَيَأْتِيهِمُ اللَّهُ فِي غَيْرِ الصُّورَةِ الَّتِي يَعْرِفُونَ، فَيَقُولُ: أنا رَبُّكُمْ، فَيَقُولُونَ: نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنكَ، هَذا مَكانُنا حَتَّى يَأْتِيَنا رَبُّنا، فَإِذا أتانا رَبُّنا عَرَفْناهُ، فَيَأْتِيهِمُ اللَّهُ فِي الصُّورَةِ الَّتِي يَعْرِفُونَ، فَيَقُولُ: أنا رَبُّكُمْ، فَيَقُولُونَ: أنْتَ رَبُّنا فَيَتْبَعُونَهُ)).

واتە: ئەم ئوممەتە دەمێنێتەوە و دووڕووەکانیشیان لەگەڵدایە، خوا ﷻ دێت بۆ لایان بەجگە لەو شێوەیەی دەیزانن، دەفەرموێت: من پەروەردگاری ئێوەم، دەڵێن: پەنا بەخوا دەگرین لە تۆ، ئەمە شوێنمانە هەتاکو پەروەردگارمان دێت بۆ لامان، ئەگەر پەروەردگارمان بێت بۆ لامان دەیناسینەوە، خوا ﷻ دێت بۆ لایان بەوشێوەیەی دەیناسن، دەفەرموێت: من پەروەردگارتانم، دەڵێن: تۆ پەروەردگارمانیت و شوێنی دەکەون.

ئیبن عوسەیمین دەڵێت: خەڵك لە ڕۆژی قیامەتدا سێ بەشن: بێباوەڕی پەتی و باوەڕداری پەتی و دووڕووەکان، بێباوەڕان هەرگیز خوا ﷻ نابینن چونکە خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ۝١٥﴾(المطففين)، باوەڕداران خوا ﷻ لە قیامەتدا و لە بەهەشتدا دەیبینن، چونکە خوا دەفەرموێت: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ۝٢٢ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ۝٢٣﴾(القيامة)، بەڵام دووڕووەکان لە مەیدانی

قیامەتدا خوا ﷻ دەبینن، دوای ئەوە نایبینن، ئەمەش حەسرەتی زیاترە، دوای ئەوەی چێژ دەبەن لە بینینی خوا ﷻ پاشان ڕێگیری ئەوەیان لێدەکرێت[1].

  

---

(١). (لقاء الباب المفتوح)(٢٠/٢٢).

پێشەوا شافعی دەڵێت: **(وَأَنَّ لَهُ إِصْبَعًا، بِقَوْلِهِ ﷺ: ((مَا مِنْ قَلْبٍ إِلا وَهُوَ بَيْنَ أُصْبُعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ الرَّحْمَنِ ﷻ)).**

واتە: بێگومان خوای پەروەردگار پەنجەی هەیە، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەفەرموێت: هیچ دڵێك نییە ئیللا لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی خوای میهرەباندایە ﷻ.

لە سوننەتدا چەند فەرموودەیەکی صەحیح هاتووە پەنجە بۆ خوای پەروەردگار دەسەلمێنێت، مسلم لە عبداللەی کوڕی عەمرەوە رضي الله عنهما ڕیوایەتی کردووە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ((إنَّ قُلُوبَ بَني آدَمَ كُلَّها بيْنَ إِصْبَعَيْنِ مِن أصابِعِ الرَّحْمَنِ، كَقَلْبٍ واحِدٍ، يُصَرِّفُهُ حَيْثُ يَشاءُ، ثُمَّ قالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: اللَّهُمَّ مُصَرِّفَ القُلُوبِ صَرِّفْ قُلُوبَنا على طاعَتِكَ)).

واتە: بێگومان دڵی هەموو نەوەکانی ئادەم لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی خوای میهرەباندایە، وەك یەك دڵ، دەیگۆڕێت و وەریدەگێڕێت چۆن بیەوێت، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: پەروەردگارا کە دڵەکان دەگۆڕیت و وەریدەگێڕیت، دڵمان بگۆڕە و وەریبگێڕە بۆ چاکە و دایبمەزرێنە لەسەر گوێڕایەڵیت.

بوخاری و مسلم لە ئیبن مەسعودەوە رضي الله عنه ڕیوایەتیان کردووە دەڵێت: ((جَاءَ حَبْرٌ مِنَ الْأَحْبَارِ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ، إِنَّا نَجِدُ أَنَّ اللهَ يَجْعَلُ السَّمَاوَاتِ عَلَى إِصْبَعٍ وَالْأَرَضِينَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالشَّجَرَ عَلَى إِصْبَعٍ، وَالْمَاءَ وَالثَّرَى عَلَى إِصْبَعٍ، وَسَائِرَ الْخَلَائِقِ عَلَى إِصْبَعٍ،

فَيَقُولُ: أَنَا الْمَلِكُ، فَضَحِكَ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ تَصْدِيقًا لِقَوْلِ الْحَبْرِ، ثُمَّ قَرَأَ رَسُولُ الله: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٧﴾﴾(الزمر).

واتە: زانایەك لە زاناكانی جوولەكە هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی محمد، ئێمە لە تەوراتدا دەبینین خوای پەروەردگار ئاسمانەكان لەسەر پەنجەیەك دادەنێت، زەوییەكان لەسەر پەنجەیەك، درەختەكان لەسەر پەنجەیەك، ئاو و خاك لەسەر پەنجەیەك، هەموو دروستكراوەكانی تر لەسەر پەنجەیەك، دەفەرموێت: من پاشام، پێغەمبەری خوا ﷺ پێكەنی هەتاكو كاكیلەكانی دەركەوت، لەبەر بەڕاستی دانانی گوتەی زانا جوولەكەكە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٧﴾﴾.

ئەم فەرموودانە پەنجە بۆ خوای پەروەردگار دەسەلمێنن بەوشێوەیەی شایستەی زاتی پیرۆزییەتی، ئیبن خوزەیمە دەڵێت: (بَابُ إِثْبَاتِ الْأَصَابِعِ لِلَّهِ ﷻ مِنْ سُنَّةِ النَّبِيِّ ﷺ قِيلًا لَهُ لَا حِكَايَةً عَنْ غَيْرِهِ)[1].

---

(١). (التوحيد)(١/١٨٧).

واتە: بابەتی سەلماندنی و جێگیرکردنی پەنجەکان بۆ خوا ﷻ لە سوننەتی پێغەمبەری خواوە ﷺ بە فەرموودەی هاتووە نەوەك لە کەسێکی ترەوە بیگێڕێتەوە؛ پاشان ئاماژە بۆ فەرموودەکەی عبداللەی کوڕی عەمر دەکات.

ئاجوڕی دەڵێت: (بَابُ الْإِيمَانِ بِأَنَّ قُلُوبَ الْخَلَائِقِ بَيْنَ إِصْبَعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ الرَّبِّ عزوجل بِلَا كَيْفٍ)[1].

واتە: بابەتی باوەڕ بەوەی دڵی دروستکراوەکان لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی پەروەردگاری باڵادەستدایە، بەبێ چواند و چۆنییەتی؛ پاشان ئەو فەرموودەی عبداللەی کوڕی عەمری لەسەر دەکاتە بەڵگە.

ئیبن عوسەیمین دەڵێت: سەلەف ڕواڵەتی ئەم فەرموودەیان وەرگرتووە، دەڵێن: خوای پەروەردگار بە حەقیقەت پەنجەی هەیە، بۆی دەسەلمێنین وەك چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کردووە و بۆی سەلماندووە، ئەوەی دڵی نەوەکانی ئادەم لە نێوان دوو لە پەنجەکانی خوای پەروەردگارە لازم نییە بە پەنجەکانەوە بخشێن و نوسابن (مماسة) هەتا بگوترێت ئەم فەرموودەیە گومانی حلول لێ دەکرێت، و دەبێت لەسەر ڕواڵەتی لێکدانەوەی بۆ نەکرێت، هەور لە نێوان ئاسمان

---

(١). (الشريعة)(٣/١١٥٦).

و زەویدا بارهێنراوە نەبە ئاسمان و نەبە زەویدا ناخشێت، دەگوترێت بەدر لە نێوان مەککە و مەدینەدایە، لەگەڵ دووری لێیانەوە، بۆیە دڵی نەوەکانی ئادەم بە حەقیقەت لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی خوای پەروەردگاردایە، لازم نییە بە پەنجەکانەوە نوسابن، و حلول ناگەیەنێت.

  

پێشەوا شافعی دەڵێت: **(وَإِنَّ هَذِهِ الْمَعَانِيَ الَّتِي وَصَفَ اللَّهُ بِهَا نَفْسَهُ، وَوَصَفَ بِهَا رَسُولُهُ ﷺ، لا يُدْرِكُ حَقِيقَةَ ذَلِكَ بِالْفِكْرِ، وَالرُّؤْيَةِ، وَلا يَكْفُرُ بِالْجَهْلِ بِهَا أَحَدٌ، إِلا بَعْدَ انْتِهَاءِ الْخَبَرِ إِلَيْهِ بِهَا).**

واتە: بێگومان ئەم مانایانە کە خوای پەروەردگار نەفسی خۆی پێ وەسفکردووە، و پێغەمبەرەکەی ﷺ وەسفی کردووە، دەرکی حەقیقەتی بە فیکر و تێڕوانین ناکرێت، و کەس کافر ناکرێت ئەگەر نەفام بێت بەم سیفەتانە، دوای ئەوە نەبێت کە بەڵگەی پێدەگات.

  

پێشەوا شافعی دەڵێت: **(وَإِنْ خَلَّفَ الْوَارِدُ لِذَلِكَ خَبَرًا يَقُومُ فِي الْفَهْمِ مَقَامَ الْمُشَاهَدَةِ فِي السَّمَاعِ، وَجَبَتِ الدَّيْنُونَةُ عَلَى سَامِعِهِ بِحَقِيقَتِهِ، وَالشَّهَادَةِ عَلَيْهِ، كَمَا عَايَنَ وَسَمِعَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ق، وَلِمَنْ ثَبَّتَ هَذِهِ الصِّفَاتِ، وَتَنْفِي التَّشْبِيهَ، كَمَا نَفَى ذَلِكَ عَنْ نَفْسِهِ تَعَالَى ذِكْرُهُ، فَقَالَ: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١١﴾(الشورى))**.

واتە: ئەگەر ئەو بەڵگەیەی هاتووە لە بارەی ئەو سیفەتەوە هەواڵێك بەجێ بهێڵێت کە هەمان ڕۆڵ لە تێگەشتندا بگێڕێت وەك ئەوەی گەواهیدەر لە بیستندا دەیگێڕێت، واجب دەبێت لەسەر ئەوانەی دەبیستن دینداری پێوە بکەن و گەواهی لەسەر بدەن، وەك ئەوەی لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستووە و بینیوە، و بۆ ئەو کەسانەی ئەم سیفەتانە بۆ خوا ﷻ دەسەلمێنن، و نەفی چواندنی (تشبیه) سیفەتەکانی دەکەن لەوەی لە سیفەتی دروستکراوەکانی بچێت، وەك چۆن خوا ﷻ ئەوەی لە نەفسی خۆی نەفیکردووە، دەفەرموێت: هیچ شتێك لە خوا ناچێت نەلە زات و نەلە سیفات و نەلە کرداری، بیسەری گوفتاری بەندەکانییەتی و بینای کردارییانە و هیچی لێشاراوە نییە.

ئیبن تەیمییە دەڵێت: ئەو ئایەتەی خوا ﷻ دەفەرموێت: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ﴾ ڕەدە لەسەر ئەوانەی (التشبیه) و (التمثیل) دەکەن، و

ئەوەی دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ ڕەدە لەسەر ئەوانەی نەفی و تەعتیل دەکەن، ئەوانەی تەمسیل دەکەن شەوکوێرن، ئەوانەی تەعتیل دەکەن کوێرن: مومەسیل بت دەپەرستێت، و موعەتیل نەبوو دەپەرستێت[1].

  

(١). (مجموع الفتاوى)(٥/١٩٦).

لەم نوسراوەدا پێشەوا شافعی کۆمەڵێك سیفەتی خوای پەروەردگاری باسکردووە و دەیسەلمێنێت وەك پێشەواکانی سەلەف بۆ خوای گەورەیان سەلماندووە، کە بریتین لە: (سميع) کە ناوێکە لە ناوە پیرۆزەکانی خوای پەروەردگار و سیفەتی بیستنی لێ وەردەگیرێت، دوو دەست، دەستی ڕاست، پێ، پێکەنین، دابەزین بۆ ئاسمانی دونیا لە کۆتایی هەموو شەوێکدا، دوو چاوی هەیە و چاوێکی کوێر نییە، باوەڕداران لە قیامەتدا دەیبینن، و پەنجەی هەیە.

  

